# ئیمان و ئازادی

## ئیسلام و شوناسە ئایینی و نەتەوەییەکان

نووسینی:

نەبەز هەورامی

چاپی یەکەم

سلێمانی...............٢٠١٢

❖ ناوی کتێب: ئیمان و ئازادی.

❖ نوسەر: نەبەز هەورامی.

❖ پیتچن: نووسەر.

❖ بەرگ: هیوا ئاوگۆزی.

❖ دیزاینی ناوەوە: هەڵکەوت هەورامی.

❖ ساڵی چاپ: ٢٠١٢.

❖ چاپ: چاپخانەی پەیوەند

❖ نۆرەی چاپ: یەکەم.

❖ لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری گەشەپێدانی چالاکی لاوان.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٣٨)ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە.

" شمشێر دەتوانێ دڵ پارچەپارچە بکات

بەڵام ناتوانێ ئیمانی تێدا بچێنێ یان لێیدەربێنێ"

ناوەڕۆک

تێبینی:

ئەم بابەتە سەرەتا وەك وتارێك بۆ دۆسیەی (نەتەوە ناسیی و نەتەوەسازیی) ژمارە (٢٢)ی ساڵی (٢٠٠٩) ی گۆڤاری (هەژان) نووسرا و لەو ژمارەیەدا بڵاوکرایەوە، پاش پێداچوونەوەو لێ لابردن و دەستکاریی نوێ و خستنەسەری بابەتی (وێنەی مەسیح لە قورئانی پیرۆزدا) ـ وەك پاشکۆ ـ کە پێوەندیی بە ناوەڕۆکی گشتیی نووسینەکەوە هەیە ـ ئەم کتێبەی لێبەرهەم هات.

وتەیەك..

خوێندنـــەوەی وەك پـــڕۆژەی ناســـیونالیزمی عـــەرەبی و تەفسیرکردنی هەنگاوەکانی بانگەواز و بڵاوبوونـەوە و غـەزلکانی لەو روانگەیـەوە و پێوەسـتکردنیان بـە سـەپاندنەوە..، یەکێکـە لەو خوێندنەوە نازانستی و نادروستانەی کە بۆ ئـایینی ئیـسلام کراوە و دەکرێت. لەمجۆرە خوێندنەوەیـەدا ئیـسلام چ وەك دەق و چ وەك بەرهـــەم و رەفتـــار، بـــولری بـــەدەنگهاتنی نیـــە و کەرەستەکانی ئەو خوێندنەوەیەش تەنیا کەرەستەی دەرەوەی فـەزای ئیـسلامن، بێگومـان مەرامەکانیـشی روون و ئاشـکران و پێشوەخت ئامادەییان هەیە.

ئەم بابەتە سەرەتا دەیەوێ ـ بەچەند ئامازەیەکی سادە ـ ئـەوە پێشچاو بخاتەوە کە ئیسلام ئایینێکی ئاسمانییە بۆ تەولوی سەر رووی زەوی بە هەموو گەل و نەتەوەکانەوە، ئایینیانەش هاتووە و بڵاوبۆتـەوە، نـەك وەك ئایـدۆلۆژیا و فەلـسەفە و تیۆـر، یـان ئایینێکی مرۆڤکرد، یان پرۆژەیەکی نەتـەوەیی عـەرەبیی"١"..، پاشان ئەم بابەتە بە وردی تیشك دەخاتە سەر زەمینەسازیی و قۆناغـەکانی دروسـتبوونی ئیمـان لـە دڵ و دەروونـدا و رێگـە و کەناڵەکانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام..، پاشان ئامانجەکانی جـەنگ و رووبەڕووبوونـەوە لـە روانگـەی قورئانـەوە، دواجـار ئـازادیی

ئابینی... تا ئێرە سنووری ئەم بابەتەیە، ئیدی نایەوێ بچێتە نێو باسی ئازادییەکانی دیکەی تاک لە ژیانی ڕۆژانەیدا، وەك: ئازادیی بەخاوەنبوون و کارکردن و خوێندن و هاوسەرێتی و بەرگری لەخۆکردن و هەڵبژاردن و ..هتد."[٢]

**ئیسلام.. گوتارێکی ئایینیانەی ئینسانیانە:**

ئەگەر بچینە نێو گوتاری هەموو پەیامە ئاسمانیەکانەوە، تەنانەت پەیامی ئایینە شێوێنراوەکان و ئایینە زەمینیەکانیش، دەبینین گوتارەکەیان ئایینی بووە و تا ئێستاش هەر لەو سروشتە ئایینیەی خۆی نەکەوتووە، سروشتێک کە گوتاری ئایدۆلۆژیا و فەلسەفە و تیۆرەکان نەیانبووە و نیانە، ئەگەر لە هەر زەمەنێکیشدا ئایین بە ئایدۆلۆژیا یان لە پێناو تەقدیسکردنی دەسەلاتێکدا بە دەمامک کرابێت، خودی ئایین خودا پەرستی و مرۆڤدۆستی و سروشتە تایبەتی و گشتیەکەی خۆی پاراستووە و خەلکێکی دی لەملاوە ئایینیانە مامەلەیان لەگەلدا کردووە.

ئەگەر لە سروشتی هاتن و بزووتن و بلاوبوونەوە و مانەوەی ئیسلامیش وردبینەوە" دەبینین وەک ئایینێکی ئاسمانیی گەورە و گەردوونیی دەرکەوت و سەرکەوت، سەرەتا لە نیمچە دوورگەی عەرەب، دوایی لە رووبەرێکی فرەوانی جیهاندا، لە دڵ و دەروونی خەلکێکی ئیکەدا جێی خۆی دەکاتەوە کە نە لەزمان نە لەکەلتور و نە لە جوگرافیادا لە عەرەب ناچن، خەلکێکی هەمەدەنگ و هەمەرەنگ روحیانە مامەلەی لەگەلدا دەکەن، ئەو روحەی کە ـ بەر لە زەوی ـ پێوەندی بە ئاسمانەوە هەیە!

لە ئێستاشدا نیشتیمانی گەورەی ئیسلام و ئیمانداریی، ئەوەندەی کە نیشتیمانێکی مەعنەویە نیشتیمانێکی فیزیکی نیە، نیشتیمانێك کە لە لەخۆگرتنی نەتەوەو رەگەز و زمانەکاندا لە هەموو نیشتیمانەکانی دیکە جیاوازە.

گوتاری قورئان:

گوتاری قورئان، هێڵەکانی ژیانی ئایینداریی بۆ مرۆڤایەتی دیاریکردووە، نەك نەتەوەیەك یان گەل و کۆمەڵێك (( یا ایها الناس اعبدوا ربکم الذی خلقکم والذین من قبلکم لعلکم تتقون/البقرة/ ٢١)) ئەو خەڵکەی کە خودا لە ئاسمانەوە بانگی دەکات، لە سەر زەویەك و لە فەزایەکدا دەژی کە مافی هەموانی ئاوێتە بووە((الم یروا ان الله سخر لکم ما فی السماوات و ما فی الارض واسبغ علیکم نعمه ظاهرة و باطنة/ لقمان/ ٢٠)).

گوتاری قورئان بە بێ هەڵاوێردن لە نێوان مرۆڤدا بەدەنگدێت، تەنانەت بە باسی مرۆڤیشەوە ناوەستێ، دیاردەی سروشتی و جیهانی گیاندارەکانی دیکەش دێنێتە نێو باسوخواسەوە و لەسەر شانۆی ژیان و لە بەندایەتیدا رۆڵیان دەدلتێ(( و لله یسجد من فی السماوات و الارض طوعا و کرها و ظلالهم بالغدو والاصال/الرعد/١٤)).

گوتاری قورئان دەیەوێت پایەی خودایەتی( هەموو جۆرەکانی بەخوداکرن و بەخودلبوون) لە مرۆڤ وەربگرێتەوە و هەمووان بکاتە بەندەی خودایەك کە شایستەی ئولوهیەتە و مافی ربوبیەتی بەسەر بەندەکانەوە هەیە..، هەر لە توانست و دەسەڵاتی گەردوونیانەی ئەویشدا هەیە رێڕەوێك بۆ بەندایەتیکردنی مرۆڤ دابنێ کە بیخاتە سەر رێگەی بەرەو کەماڵچوون، نەك رێگەی ئەو بەندایەتیەی کە مرۆڤەکان هێندێکیان ببنە خودای هێندێکیان و ئەوانی دیکەش کۆیلەی ئەوان، کە ئەم کۆیلایەتییە هەرگیز شایستەی مرۆڤ و ئەو کەرامەتە ئاسمانیە نیە کە خالیق پێیبەخشیوە.

لە گوتاری قورئاندا بەرزیی و نزمیی لە پایەدا، پێوەندی بە بەرێزو بەرهەمەوە هەیە نەك رەگەزو نەتەوە((.. لیبلوکم ایکم احسن عملا /تبارك/٢ )) .. قورئان کە ستایشی پێغەمبەری ئیسلامیش(د.خ ) دەکات، لە بەر عەرەبیی بوونیی یان قورەیشی بوونی نایکات، بەڵکو لەبەر بەرزیی و نموونەیی بوونی ئاکاریەتی (( وانك لعلى خلق عظيم/القلم/ ٤ ))..، ئەو خودایەی لە قورئاندا شتایشی پێغەمبەر و یارە بە رەگەزعەرەبەکانی دەکات، سەرکۆنەی بێباوەڕە بەرەگەز عەرەبە نیزیکەکانیشی دەکات، دیارە لە سەر بنەمای چاکەکاریی و خراپەکاریی.

پاشان خودا خەلافەت و وەکالەتی خۆی لە سەرزەویدا بۆ کەس و نەتەوەیەکی دیاریکراو قۆرخ نەکردووە، بەڵکو مرۆڤی بەگشتیی بە خەلیفەی خۆی ناوبردووە ((هو الذی جعلکم خلائف فی الارض /فاطر/ ٣٩)) مانەوەو میرات و دەسەلاتی سەرزەویش بۆ چاکەکارانە، بۆ ئەوانەی کە دەزانن ئەرکی مرۆڤ لە ژیاندا ئاوەدانکاریە ـ بە مانا قووڵ و فرەوانەکەی((الذین ان مکناهم فی الارض اقاموا الصلاة و اتوا الزکاة و امروا بالمعروف و نهوا عن المنکر ..الحج/٤١)).. ،((وعد الله الذین امنوا منکم و عملوا الصالحات لیستخلفنهم فی الارض.../النور/٢٤)).

جا ئەگەر مرۆڤەکان لەو ئاستەی بەرپرسیارەتی و رێزلەخۆگرتندا بوون* بە ئەرکی دەزانن مانای (لتعارفوا) ـ وەك هەوێنی ژیان ـ لە نێو خۆیاندا بەرجەستە بکەن.

بۆ ژیانی پاش زیندووبوونەوەش، بەهەشتیی بوون و گەیشتن بە مەقامی بەرز* پێوەندی بە ساغیی دڵ و جوانیی و دروستیی کردەوەوە هەیە نەك رەنگ و رەگەز و شتی دی:

ـ (( یوم لا ینفع مال ولا بنون الا من اتی الله بقلب سلیم/ الشعراء/ ٨٨ /٨٩))

ـ (( وکلهم اتیه یوم القیامة فردا /مریم/ ٩٥ )).

ـ(( کل نفس بما کسبت رهینة / المدثر/ ٣٨)).

پاشان وەستان و قسەکردن بەو قووڵیە لەسەر عیبادەت و ئەخلاق و باوەڕبوون بە زیندووبوونەوە و گەیشتن بە نەمریی، باس و بابەتی گوتاری ئایینیانەن..، ئەگەر بەگشتی لە دروشمە عیبادەتیەکانیش وردببینەوە" دەبینین ئامانجە سەرەکیەکەیان زیندووراگرتنی پێوەندی نێوان مرۆڤ وخودا لە لایەکەوە، لە نێوان مرۆڤ و برای مرۆڤیدایە لە لایەکی دیکەوە.

لە بارەی سیاسەت و دەسەڵاتیشەوە، قورئان هێندێ بنەمای گشتیی دیاری کردوون کە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەکن، بۆ هەموو موسڵمانانن لە هەر زەمین و زەمانێکدا بن، نەك بە تەنیا بۆ نەتەوەی عەرەب، لەو بنەمایانە: شورا ( بە فۆرمە جیاوازەکانیەوە)، دادپەروەری، مافپەروەری..، ئیدی کاروبارەکانی دیکەی دەوڵەت و دەسەڵاتداریتی، بۆ مرۆڤ بەگشتیی ـ بەجێهێڵراون بە پێی ژیانی سەردەمەکەی، بەپێی تایبەتمەندیەکانی خۆی لە رووی جوگرافیی و مێژوویی و رۆشنبیری و کزمەڵایەتیەوە، نەك ئیسلام فۆرمێکی ژیانی سیاسی و حوکمڕانیی نەگۆڕی هێنابێت تایبەت بە نەتەوەیەك.:

**گوتاری پێغەمبەری ئیسلام(د.خ):**

بەر لەوەی لە گوتاری بیستراوی بدوێین" دەبینین سروشتی هەڵسوکەوتی، پلەو پایە ئاسمانیی و زەمینیەکەی و ئەو کاریگەرییەی لە سەر دڵ و دەروون و عەقڵ و روحی مرۆڤەکانی دەوروبەری هەیبوو (واتە گوتاری بینراوی) گوتارێکی پێغەمبەرانە بووە نەك گوتاری سەرکردەی نەتەوەیەك، *پاشان خەم و ئەرکەکەشی ـ کە لە ئاستی قووڵیی خەم وخواستەکانی مرۆڤایەتیدا بووە نەك نەتەوەو گەلێك ـ پێغەمبەرانەبووە،* هەرگیز کەسی دیکەش وەك ئەو دارای ئەو توانا رۆحیی و عەقڵییە کاریگەر و کەمەندکێشکەرە نەبووە و نا شبێت..، *موحەممەد(د.خ) شاعیر و فەیلەسوف و بیریارو زاناو موسڵیح و* سیاسی نەبوو تا پرۆژەو پەیامەکەشی لە پرۆژەو پەیامی ئەوان بچێ، بەڵام دەشێ بڵێین هەڵگری خەمی هەموو ئەوانە بوو بە یەکەوە"٢"، ئەیارەکانی ئامادەبوون هەموو پایەیەکی ئەو دەمەی بدەنێ، بەمەرجێك واز لە پایە ئایینیەکەی بهێنێ، لەو پێناوەشدا رووبەرووی سەختترین جۆرەکانی سزاو ئەشکەنجەی دەروونیی و جەستەیی بووەوە..سزاو ئەشکەنجەیەکی وەها کە هەرگیز کەسی دی نەتوانێ بەرگەی بگرێ !

گوتاری بینراو و بیستراوی پێغەمبەر(د.خ)، بۆ مرۆڤایەتیە بە گشتی، چەند فەرموودەیەکی راشکاوانە بانگەوازی دەمارگیرییان

لە دەرەوەی جوغزی بانگەوازی ئایینی دانـاوە ( لـیس منـا مـن دعا الى عصبية..، و ليس منا من قاتـل علـى عـصبية..، و لـيس منا من مـات علـى عـصبية /ابـودلود) ..(كلكـم مـن ادم وادم مـن تراب..، لا فضل لعربيى على اعجمـى ولا لابـيض علـى اسـود..الا بـالتقوى/ترمـذى). ئـەم فەرموودانـە بەشـێك بـوون لـە (وتـاری حـەجی ماڵئـاوایی) پێغەمبـەر(د.خ)، لـە کاتێکـدا کـە ئیـسلام بەسەرکەوتنی زۆر گەورە گەیشتبوو.

ئەو نەک لەسەر بنەمای عـەرەب بـوون پێوەنـدی دانەڕشـتووە، بـەڵکو پێوەنـدی خـوێن وخزمایەتیـشی لـە فـۆرمێکی نوێـدا داڕشـتەوە، دەبـوو خۆشەویـستی خوداوەنـد و پێغەمبـەر و بەرنامەکـەی( لـە پێنـاو مرۆڤایەتیـدا) لەسـەروو هـەموو جۆرە خۆشەویستیەکی دیکەوە بێت، خۆشەویستی خێڵ و کەسـانی نیزیـك و زێـدیش (( قـل ان كـان ابـائكم و اخـوانكم و ازواجكـم وعشيرتكم واموال اقترفتموها ...... احب اليكم من الله و رسوله و جهـاد فـي سـبيله .. فتربـصوا حتـى يـاتى الله بـامره ../ التوبة/٢٤))..، (( و ان جاهداك على ان تشرك بى ما ليس لـك بـه علـم فـلا تطعهمـا/لقمـان..)) بـەڵام لـەدەرەوەی باسـی ئیمـان، چاکەکاریی دەبێتەوە بە بنەمای پێوەندیی((.. و صاحبهما فـى الدنيا معروفا/لقمان/١٥ ))..، بە گشتی ئیسلام پێوەندی نێوان

مرۆڤ وخودا و مرۆڤ و مرۆڤی لەسەر بنەمای ئایینی ـ قووڵتر و فرەوانتر تازەکردەوە.

بانگەوازی موحەممەد( د.خ )، بانگەوازی هەڵگەڕانەوە بوو لە ئاڕاستەکانی دەمارگیری و سیستمی کۆیلایەتی و نەریتە نادروستەکانی خێڵایەتی و ...، پاشان دەستبردن بۆ بریندارکردن و شکاندنی بتەکانی باوان لە دڵ و دەروونیدا، بەرانبەرەکانیش دەیانگوت:((حسبنا ما وجدنا علیە اباشا/المائدة/ ١٠٤))!

پاشان ئەو بەرنامە پەروەردەییە رۆحیی و ئەخلاقییەی موحەممەد (د.خ) لەژێر تیشکی هەتاوی وەحیدا ـ بەو وردیە بۆ مرۆڤی داڕشت ـ لە لەدایکبوونەوە تا مردن و زیندووبوونەوە...، لە باسی پاکوخاوێنییەوە تا هێندێ لایەنی سیاسەتکردن، ئایینیی بوو(( هوالذی بعث فی الامیین رسولا منهم یتلوا علیهم ایته و یزکیهم و یعلمهم الکتاب و الحکمة../ الجمعة /٢))...، وەك دەبینین ئەو بەرنامەیە چۆتە نێو شتی وەهاوە کە ئایدۆلۆژیا و فەلسەفە و تیۆرەکان خۆیان لە قەرەی ئەو بابەتانە نادەن، گوتاری ئەو ئەگەر گوتارێکی ئایدۆلۆژیی یان گوتاری پرۆژەیەکی نەتەوەیی بوایە چ پێویستی دەکرد بچێتە نێو باسوخواسی لە دایکبوونی مرۆڤ و شیرپێدان و ناو لێنانیەوە یان مردن و کفن و

دڵی کردنی، چیدا بوو لە دڵنانی ئەو بەرنامە ورد و چڕوپڕەی عیبادەت و دانانی ئەو هەموو زیکرو ئەوراده بۆ هەر جوڵەو هەنگاوێکی ژیان؟ لە ڕاستیدا ئامانجی گوتاری وەها، هەر ئامانجی گوتارێکی ئایینیە.

پاڵپەرەتاران لەبەردەم هەکوتاری ئایینیدا:

سەرەتا کە بە نهێنی ئیمان گەیشتە نێو دڵ و دەروونی چەند تاکێکی دیار لە کۆمەڵگەی مەککەییدا، بەرچاوڕوونیەکی گەورە و دونیابینیەکی تازەیان بۆ دروستبوو، هەستیان بە ئازادبوونی ئیرادە و روحیان دەکرد، چونکە قورئان بە پلەی یەکەم لەگەڵ روح مامەڵە دەکات و خۆیشی بە روح ناوبراوە ((وكذلك اوحينا اليك روحا من امرنا/الشورى/٥٢ )) دیارە سەرچاوەی هەردوو روحەکەش خودایە ((و نفخت فيه من روحي..../ ص/٧٢)) لەو سەرەتایەوە لەبەر گرنگیی و گەورەیی ئەو گۆڕانە و زەمینەی گۆڕانەکە - زەمینەی دەرەکی و نێوەکی - دەبوو بە نهێنی گۆڕانکاریەکە بکرێ.

قۆناغی بانگەوازی نهێنی ـــ وەك بناغەی چەسپاندنی ئیمان ـــ زۆر لەوە بەدوور بوو کە بێجگە لە ئامانجی ئایینی ئامانجێکی دیکەی هەبێت.

پاشان ئەو ناوو خەسڵەتانەی کە ئیسلام بەرەبەرە خستنیەوە نێو کایەکانی ژیان وەك: باوەڕدار، برا، موحسین، موتتەقی، تەوبەکار، ،ئیمام، خەلیفە...هەروەها: کافر، موشریك، دووڕوو، عاسیی، فاسیق ... ناوو خەسڵەتگەلێك بوون کە پێوەندییان بە ئیمان و فەزای ئایینیەوە هەبوو، بێباوەڕانیش نەیاندەگوت موسڵمانەکان هەلگری (فلان بیرو پرۆژەن)، بەڵکو دەیانگوت لە ئایین و باوەڕی ئێمە و باوان هەلگەڕاونەتەوە، بێگومان ئەگەر مەسەلەکە دین و ئیمان نەبوایە، نەیاران هێندە سەغڵەت نەدەبوون.

ئیسلام نەهات - وەك دەگوترێ (لەسەر بنەمای نەتەوایەتی، عەرەب لەچەند خێڵێکی پرژوبڵاوەوە یەکبخاتەوە) ـ بەڵکو کردی بە دوو بەرەوە، دوو بەرەی لێکجودا لە وێناکردن و روانینیان بۆ ژیان و مردن و نەمریی..، لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام لە خۆیدا هەلگری رۆحی پێکەوە ژیان بوو لەگەڵ بەرەی بەرانبەریدا ((عسی الله ان یجعل بینکم و بین الذین عادیتم منهم مودة.. والله قدیر.والله غفور رحیم/الممتحنة/٧))..((و انا او ایاکم لعلی هدی او فی ضلال مبین/سبا/٢٤)).

راستە پەیامی ئیسلام پەیامی یەکخستنە(( واعتصموا بحبل الله جمیعا ولا تفرقوا ......فالف بین قلوبکم فاصبحتم بنعمته اخونا../ال عمران/ ١٠٣)) یەکخستن تا ئاستی برایەتی و ئیسارو

یەکجەستەییش (مثل المؤمنین فی...... کمثل الجسد الواحد ../بوخاری)..، بەڵام ئیسلام یەکخستنێکی عەرەبیانەی مەبەست نیە، بەڵکو مەبەستی یەکخستنی هەموو ئەوانەیە دێنە ژێر ئاڵاکەیەوە بەجیاوازی ناسنامەی ئەتەوەییان و بەبێ ونکردنی تایبەتمەندیە خوداکردەکانیشیان، جا یەکخستنی خێڵە بڵاوەکان بە چەسپاندنی ئینتیمای ئاینی بوو نەك نەتەوەیی.

لە کاتەکانی جەنگیشدا، سروشتی جەنگەکان هەر لەسەر بنەمای ئەو دوو بەرەییە بووە، دەشێ لای موشریك و بێباوەڕەکان ئینتیما بۆ خێڵ بەر لە هەر ئینتیمایەکی دیکە بووبێت، بەڵام دوای دەرکەوتنی ئیسلام و رووبەڕووبوونەوەی، لای ئەولێنیش ـ چجای موسڵمانەکان ـ ئینتیما بۆ خێڵ ــ ئەگەر نەڵێین کاڵ بۆوە ـ ئاوێتەی ئینتیما بۆ وەسەنیەت بوو.

جەنگی بەدر، وەك یەکەمین جەنگی نێوان ئەو دوو بەرەیە، ناوی جەنگی جیاکەرەوەی بەرەکانی لێنرا و رۆژی جەنگەکەش کرا بە رۆژی هەڵاوێردن (( یوم الفرقان... یوم التقی الجمعان / الانفال/٤١)).

لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسین: ئەگەر جەنگی موسڵمانان لەگەڵ نەتەوەکانی دی..لەگەڵ رۆم و فارس و تورك و ..هتد، بە هەستی عەرەبایەتی و بۆ داگیرکاری بوو، ئەی جەنگە گەورە و حاسیمەکانی سەرەتا (بەدرو ئوحدو ئەحزاب و ...هی دی) کە

لەگەڵ خودی عەرەب بوون ـ تەنانەت لەگەڵ کەسانی نیزیك لە پێوەندی خوێندا ـ لە پێناو چیدا بوون؟! کە ئەگەر موسڵمانان لەو جەنگانەدا سەرنەکەوتبان، دەنگی ئیسلامەتی نەدەگەیشتە دەرەوەی نیمچەدوورگەی عەرەب .

**پرۆسەی دروستبوونی ئیمان..سەپاندن یان هیدایەت و پەیمان بەستن:**

ئیمـان - وەك گـەورەترین بنـەمای ئـایین - وەك هەسـتێکی نێوەکیی پێوەسـت بـە فیترەتـەوە، وەك خواسـتێکی روحیـی و دەروونیی و پاشان رەنگدانەوەی وەك پێویستیەکی کۆمەڵایـەتی و ئەخلاقیی، ئاوێتەی پێکهاتە و ژیانی مـرۆڤ و کۆمەڵگە دەبێـت نەك وەك فـشارێك کـە لـە دەرەوە بەسـەریدا بـسەپێنرێ ((فـاقم وجهك للـدين حنيفـا فطـرت الله التـي فطـر النـاس عليهـا /الـروم/ ٣٠)).

بەشـێك لـەو پێناسـانەی کـە لـەدەرەوەی خـودی ئـایین و (وەحی)یشەوە بۆ ئایین کراون، هەر ئەوەیان لێدەقامرێتەوە کـە ئایین هەڵقوڵاوی فیترەت و ناخی مرۆڤ و پێویـستیەکی روحیـی و دەروونیی و کۆمەڵایەتی بێت، پێناسەکانی هەر یەك لە (سـبنـسر و مولر و شیلر و ..هی دی) ئاییـنیان بـە ئیحـساس و بـە غـەریزە ناویردووە "٤".

ئیمـان یـان ئـایین چـونکە تەفـسیرە بـۆ خـوداو خـالیق و سـەرەنجامی مـرۆڤ پـاش مـردن و دونیـای غـەیب بـە گـشتی، رێکنەکەوتووە ژیانی مرۆڤ لە هیچ سەردەمێکدا خاڵیی بووبێت لە ئایینداریی و تەفسیری ئایینیانە بۆ بوون و ژیان، دەتوانین بڵێین

ئەمــه راســتییەکە زۆربــەی کۆمەڵناســان و مرۆڤناســانیش پشتیوانیی لێدەکەن.

زانستی دەروونناسیی نوێش ئەوەی چەسپاندووە کە ئـایین هـەر لە ناخی کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتیـەوە سـەریهەڵداوە، تەنانەت (ئۆگەست کۆنت و جیوفان ئاند) بۆ ئەوە دەچن کـە لـە نێو گیانلەبەرانی دەرەوەی جیهانی مرۆڤیشدا، هەستی ئـایینی بوونی هەبێت"٥".

مــرۆڤ ئەگــەر ئــایینی ئاسمانیــشیی پێنەگەشــتبێ، یــان نەیویستبێت دوای بکەوێت جۆرێك لـە ئـایینی دیکـەی بۆخـۆی بەرهەمهێناوە، لـە ئێستاشدا ئـەو هـەموو فەلسـەفە و زانسـت و تیۆر و ئایدۆلۆژیایانە نەیانتوانیوە رۆڵی ئایین بۆ مـرۆڤ ببیـنن و ئەو بۆشاییەی بۆ پڕبکەنەوە، لە ئێستاشدا "پاش بانگێشەکانی مردنی خوداوەند و ئایین تلیـاکی گەلانـە" ئـایین لـە جیهانـدا بـە ئاوێتەیی لەگەڵ کایەکانی ژیاندا بوونی خۆی پاراستووە.

ئاوێتەبوونی ئایین بە مـرۆڤ بەجۆرێکـە دەتوانرێـت بـە پێناسـەی مرۆڤـەوە پێوەسـت بکرێـت، وەك چـۆن ئەرەسـتو دەیگـوت " الانسـان حیـوان نـاطق" بـە بۆچـوونی کەسـێکی وەك (فـراس السواحیش) ـ کە لە کایەی ئاییناسییدا کار دەکات ـ دەگونجێ "مرۆڤ بە کائینێکی ئاییندلریش پێناسە بکرێت."٦"

پـاش باسـی (فـيترەت)، خـوای گـەورە ئيمـان بـە هيدايەتـەوە دەبەستێتەوە، هيدايەتيش واتە "روونكردنەوە و رێنيـشاندان "، وەك چۆن ئەستێرە دەبن بە رێنيشاندەری رێبواران لەتاريكاييدا ((وهو الذی جعل لكم النجوم لتهتدوا بها فی ظلمـات الـبر والبحـر/ الانعام/ ٩٧)) هيدايەت ـ وەك لەم ئايەتەشدا ديارە ـ پێچەوانەی رێلێتێكدان يان گومرا بوونە((فمـن اهتـدی فانمـا يهتـدی لنفـسه، ومن ضل فانما يضل عليها/ الاسراء/ ١٥)).

هيدايەت ـ لە رێگەی پێغەمبەرانەوە ـ ئامانجی بنـەڕەتی تـەواوی پەيامـە ئاسمانيـەكان بـووە، قورئـانيش بەهەمانـشێوە ((ذلـك الكتاب لاريب فيه هدی للمتقين/ البقره/٢)) ... قورئانی پيرۆز، تەورات و ئينجيلی ـ وەك دوو پەيامی ئاسمانيی پێش خۆی ـ بە هيدايەت و نوور(رۆشنكەرەوە و رێنمايی) ناو بردوون (( انا انزلنا التـوراة فيهـا هـدی و نـور... و اتينـاه الانجيـل فيـه هـدی و نور/المائدة/ ٤٤ ـ ٤٦))"٧".

پاشان ئيمان پێوەندييەكی ئاوێتەيی بە (دڵ)ەوە هەيـە، ((انمـا المؤمنون الذين اذا ذكر الله وجلت قلـوبهم واذا تليـت علـيهم اياتـه زادتهم ايمانا و علی ربهم يتوكلون، الذين يقيمون الصلاة اولئك هم المؤمنون حقا/ الانفال/ ٢ ـ ٤ )) بەرهەمی ئيمانيش ئەوەيە چەند ئايەتێكی سـەرەتای سـوورەتی (المؤمنـون) دەريخـستووە ((قـد افلح المؤمنون الذين هم فی صلاتهم خاشعون...تا والذين هـم

لاماناتهم و عهدهم راعون)) دیاره ئەوخەسڵەت و نیشانانەش بە خۆشەویستی و عیشقەوە پێچراون و هیچ پێوەندیەکیان بە پاڵنەری دیکە و بە سەپاندنەوە نیە(( والذین امنوا اشد حبا لله/البقرة/١٦٥)).

لە قورئان و فەرموودەدا (دل) لە وەرگرتن و وەرنەگرتنی ئیماندا رۆڵێکی سەرەکیی و سەنتەریی هەیە، بۆ ئەو مەبەستە با بە خێرایی سەیری ئەم دەقانە بکەین:

- الذین امنوا و تطمئن قلوبهم، الا بذکر الله تطمئن القلوب/ الرعد/ ٢٨.

- ومن یؤمن بالله یهد قلبه /التغابن/ ١١.

- ولما یدخل الایمان فی قلوبهم/الحجرات/ ١٤.

- والذین یؤتون ما اتوا و قلوبهم وجلة / المؤمنون /٦٠.

- ...و قلبه مطمئن بالایمان /النحل/ ١٠٥.

- ولکن قست قلوبهم /الانعام/ ٤٣.

- فویل للقاسیة قلوبهم / الزمر/ ٢٢.

- ختم الله علی قلوبهم/البقرة/٧.

- واما الذین فی قلوبهم مرض/الشوری/١٢٥.

زیندووبوونەوە - وەك یەكێك لە پایەكانی ئیمان - نەك هەر باوەرپێهێنان، بەڵكو پێویستی بە یەقینی قەلبیی هەیە، نەك هەر بۆ مرۆڤ بە گشتی بەڵكو بۆ پێغەمبەرێكی گەورەی وەك

حەزرەتی ئیبراهیم کە بە باوکی پێغەمبەران ناسراوە(س)، پێغەمبەرانێك کە وەزیفەی سەرەکییان چەسپاندنی ئیمان بووە((و اذ قال ابرهیم ربي ارني كيف تحي الموتى..قال او لم تؤمن.. قال بلى.. ولكن ليطمئن قلبي/ البقرة٢٦٠)).

تەنانەت برایەتی ئاینیش کە پایە و پارێزەرێکی بنەڕەتیی ئیسلامە و پێوەندی دەرەکیی موسڵمانانە" هەردەبێ لە دڵەوە سەرچاوە بگرێ (( فالف بين قلوبهم/الانفال/ ٦٣))..دیارە مەبەستیش لە دڵ لەو ئایەتانەدا پارچە گۆشتەکە نیە. وەك عەللامەی شەهید مامۆستا ناسری سوبحانیی لە (بانگەوان) و چەند وتەیەکی دیکەدا روونیکردۆتەوە ــ دڵ لێرەدا خەسڵەتی عەقڵیانە و بیرکردنەوە و تێگەیشتنی هەیە( لهم قلوب يعقلون بها/الحج/٤٦).

بە پشتبەستن بەم دەقانە و چەندین دەقی دیکەی روون و راشکاو" دەردەکەوێت ئەو ئیمانەی کە ئیسلام داوای دەکات شوێنەکەی دڵە و لەوێوە دەسەڵاتی ئیمان فەرمان بۆ هەنگاونان وجموجوڵی جەستە دەردەکات ( الا و ان فى الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله و اذا فسدت فسد الجسد كله..الا و هي القلب../ بوخاری و موسلم)..، دیارە ئیمانیش بە تۆپزی لەو جێیە یاخییەدا ناچەسپێ، "نووکی شمشێر دەتوانی دڵ پارچە پارچە بکات، بەڵام ناتوانێ ئیمانی تێدا بچێنێ یان بیسڕێتەوە"،

چونکە دڵ رووبەرێکە تەنیا و تەنیا خاوەنەکەی دەسەڵاتی بەسەریدا دەشکێ و بۆی رکێف دەکرێ، تەنانەت جاری وا هەیە خاوەنەکەشی ناتوانێ لە رووی پابەندبوونەوە بە تەواوی رکێفی بکات، چونکە مەیدانی ململانێ نێوەکییەکانە، بۆیە ئەو ئیمان و عیشقەی ئیسلام داوای دەکات زۆر لەوە قووڵترو گەورەترو فرەوانترە کە بە تۆبزی بئاخنرێتە نێو شوێنێکی وەك دڵەوە.. دڵ ئەگەر ئامادەیی تێدا بوو بۆ ئیمان، ئیدی دەکرێتەوەو فرەوان دەبێت، فرەوانییەك کە ناوی (اللە) بەو گەورەییە لە خۆی دەگرێت، بە تەرزێك کە دەشبێتە عەرشی پەروەردگار، وەك پێغەمبەر(د.خ)فەرموویەتی:(قلب المؤمن عرش الرحمن/)..، خودای گەورەش دەفەرموێ: ((فمن یرد الله ان یهدیه یشرح صدره للاسلام))،ئەگەر ئامادەییشی تێدا نەبوو بۆ وەرگرتنی ئیمان، سنگی(دڵی) دێتەوەیەك ((ومن یرد ان یضله یجعل صدره ضیقا حرجا کانما یصعد فی السماء/الانعام/١٢٤)) تا وەهای لێدێت دڵ بەرە و داخران و چوونەوە یەك دەچێت((افمن شرح الله صدره للاسلام فهو علی نور من ربه فویل للقسیة قلوبهم من ذکر الله/الزمر/٢٢)) پاشان بەرەو بەبەردبوون..(( ثم قست قلوبکم من بعد ذلك، فهی کالحجارة او اشد قسوة/البقرة/٧٤)). ئیدی پێدەچێ هەر ئەمجۆرە دڵانەش

بن شایستەی ئەوەبن کە بە یەکجاریی مۆریی داخرانیان لێبدرێت ((ختم الله علی قلوبهم/البقره/۷)).

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ قۆناغی بانگەوازی نهێنی، دەبینین گفتەکردنی ئیمان بە کۆمەڵێ هەنگاوی وردی پەروەردەییانە و حەکیمانەی یەکبەدوای یەکدا بەرهەم هاتووە، کە لە پێگەیاندنی خودی پێغەمبەرەوە (د.خ)دەستی پێکردووە(( اقرا باسم ربك الذی خلق/العلق/۱...))..(( قم اللیل الا قلیلا ...انا سنلقی علیك قولا ثقیلا../المزمل/ ۲ـ۵ ))..پاشان (( قم فانذر../ المدثر/۲)) تەنانەت ئەویش ـ کە خوداوەند خۆی بە تایبەت قورەکەی بۆ پێغەمبەرێتی شێلاوە ـ پێویست بووە ئیمان بهێنێ((امن الرسول بما انزل الیه من ربه/ البقرة/۲۸۵)).

زیندوو راگرتنی دڵ ودەروون و رۆح و ئاوەدانکردنەوەیان بە ئیمان، کردەیەکی وا خێرا نیە بە زۆر و بە زوویی کۆتایی پێبێت، بەڵکو ئەم کردەیە دەبێ بناغەیەکی پتەوی هەبێت و...، دەبێ تا کۆتایی ژیانیش بەردەوامبێت و لە ئەخلاق و عیبادەت و پابەندبوون و تێکۆشاندا رەنگبداتەوە ((واطیعوا الله ورسوله ..ان کنتم مؤمنین/ الانفال/۱))..پێغەمبەریش(د.خ) فەرموویەتی(..و افضل المؤمنین ایمانا احسنهم خلقا../صحیح الجامع الصغیر۳۲۳۳).

رێککەوتووە کەسێك پاش ژیانێکی باوەڕدارانە، سەری لە بێباوەڕییەوە دەرچوووبێت، یان بە پێچەوانەوە، کەواتە ئیمان کە دروستیش بوو بەردەوام پەروەردەکردنی دەوێت(( و اذا تلیت علیهم ایاته زادتهم ایمانا وعلی ربهم یتوکلون الانفال/٢ )).(( یاایها الذین امنوا، امنوا بالله و رسوله.../النساء/١٣٦)).

دروست بوونی ئیمان بە بۆچوونی عەللامەی شەهید مامۆستا ناسری سوبحانیی، پێوەندی بە بالآکردنی نەفس(رۆح)ی مرۆڤەوە هەیە لە سێ قۆناغدا:

- قۆناغی وەرگرتن.
- قۆناغی گۆڕین و کردنی وەرگیراوەکان بە بەشێك لە خود(بەمەلەکە بوونی خەسڵەتە ئیمانیەکان).
- قۆناغی بەرهەم و بەخشین.

ئەمانەش لە رێگەی سێ هێزەوە(هێزی بینین و هێزی دڵ و هێزی بیستن)، هەر هێزێکیش لەو سێ هێزەی سەرەوە بەرپرسە لە بەرخورد لەگەڵ شتێکدا:(هێزی بینین: ئایاتی ئافاق و ئەنفوس..هێزی دڵ: بیرکردنەوە لە دروستکراوەکان و دەرخستنی نادیار لە رێگەی دیارەوەو دروستبوونی جیهانبینی...هێزی بیستن: وەرگرتنی هەڵوێست لە رێگەی وەحیەوە بۆ تەبابوون لەگەڵ سیستمی گشتیی گەردووندا).

وەزیفەی ئایەتە هەرەدیارەکەی بانگەوازیش دروستکردنی ئەو گۆڕانکاریانەیە لە دڵ و دەروونی بەرانبەرەکاندا ((ادع الی سبیل ربك بالحكمة و الموعظة الحسنة وجادلهم بالتی هی احسن/ النحل/ ١٢٥)) ئەم ئایەتەش بە سێ قۆناغ جێبەجێکراوە: (قۆناغی حیکمەت، قۆناغی ئامۆژگاری چاکەکارانە، قۆناغی وەڵامدانەوە و موجادەلە بە باشترین شێوە و شێوان)، جا ئەم سێ قۆناغە وەك پێوەندییان بە نەفسی یان بە ئاستی باوەڕی بانگخوازەوە هەیە" پێوەندییشیان بە جۆری هەڵوێست و ئاستی وەڵامدانەوە و کاردانەوەی بەرانبەرەکانەوە هەیە)"٨". جا ئیمان لە ئەنجامی ئەو هەموو زەمینەسازیی و گۆڕانکارییانەوە دروست دەبێت، نەك بە سەپاندن...

بۆ گۆڕانکاری بە گشتی و پابەندبوونیش بە حەرام و حەڵاڵەوە، ـ وەك بەشێك لە ڕەحمەت و حیکمەت ـ ئیسلام ڕیزبەندیی و پلە پلەیی(تدرج)ی کردۆتە بنەما، کە ئەگەر سەپاندن ڕێگەی بولیە، ئەوە پێویست نەدەبوو.

خوای گەورە لە ئایەتی بانگەوازدا ((ادعوا الی سبیل ربك)) هەر داوای بانگەواز ناکات، بەڵکو دەبێ بانگەواز وگفتوگۆکە بە حیکمەت(بالحكمة) و باشترین جۆری ئامۆژگاری((والموعظة الحسنة)) باشترین شێوازی وەڵامدانەوە بێت(( و جادلهم بالتی

هی احسن)). هەر بەگشتی قورئان ئەگەر بەشێکی (ئەمرونەهی) بێت، بەشێکیشی شێواز و ئەخلاقە بۆ گەیاندن و پابەندکردن، گەیاندن و(ئەمرونەهی) بەبێ حیکمەت و ئەخلاق نەك هەر بەرهەمی نابێت بەڵکو دەشێ کێشە و پرینگانەوەش دروست بکات، وەك چۆن بەردەوام هێندێ گروپ و کاراکتەر بەناوی جۆراجۆری ئاینیەوە، ئاینیان لە(ئەمرونەهی)دا کورت هەڵێناوە بەبێ (حیکمەت) و خوێندنەوەی بارودۆخ و رەچاوکردنی تایبەتمەندیی زەمان و زەمینە و بەبێ لەبەرچاوگرتنی بنەماکانی رەحمەت و شەفەقەتی ئیسلام..،بە بێ رەچاوکردنی ئەو راستیەی کە بانگەواز بەو شێوازەش ئەو ئایەتە داوای دەکات بۆ بێباوەڕانە، چ جای موسڵمانانێك کە دەشێ تێگەشتنیان یان پابەندبوونیان نەبێت یان لاواز یان لە ئاستی پێویستدا نەبێت.

دەکرێ کەسێك بە زۆر و لە ترسان یان بۆ مەرامی بچووك شایەتمان بهێنێ یان نوێژ بکات، بەلأم مەرج نیە ئیمانێکی دروستی هەبێت، بەڵکو ئەو کاتە ئیمانێکی موناففیقانەی دەبێت، چەندین ئایەت باس لە ناساغیی دڵ و دەروونی موناففیق دەکەن (( ومن الناس یقول امنا بالله و بالیوم بالیوم الاخر و ماهم بمؤمنین، یخادعون الله والذین امنوا وما یخدعون الا انفسهم/البقرة/٨))، یان ئیمانەکەی وەك هی ئەوانەیە لە

بارەیانەوە گوتراوە ((قل لم تؤمنوا ولكن قولوا اسلمنا و لما يدخل الايمان في قلوبكم/ الحجرات/ ١٤)). یان ئەوانەی بەدەم باوەڕدارن بەڵام دڵیان خاڵییە لە باوەڕ(( قالوا امنا بافواههم ولم تؤمن قلوبهم/المائدة/٤١)).

ئیمانهێنان، رازیبوون یان بە راستزانینە بەدڵ، ئەوجا دەربڕینیەتی بە زمان و بە جەستە، یان دەتوانین بڵێین: پێش باوەڕ گومان و پرسیار، پاشان بیرکردنەوە و رامان، ئەوجا یەقین و ...، دواتر پابەندبوون.

کەواتە ئیسلام لە دڵی مرۆڤەوە دەستی پێکردووە نەك لە داگیرکردنی خاك و سەپاندنی رواڵەتیانەوە، تا بەرەو ( دڵ و ناخ)ی مرۆڤەکان نەکشاوە و داگیری نەکردووە، نەیتوانیوە کار لەسەر لایەنەکانی دیکەی ئاین بکات لە دەرەوەی مرۆڤدا.

پاشان ئیمانهێنان پەیمان بەستنە لەگەڵ خودا، پەیمان بەستنیش ـ دوای یەکلایی بوونەوەی دڵ ـ دەبێ مرۆڤ خۆی دەستی بۆ درێژ بکات، نەك کەسی دی بەسەریدا بیسەپێنێ(( ان الذين يبايعونك انما يبايعون الله يد الله فوق ايديهم، فمن نكث فانما ينكث على نفسه ومن اوفى بما عاهد عليه الله فسيؤتيه اجرا عظيما/ الفتح/١٠))، لە ئایەتێکی دیکەدا قورئان بە روونیی بەیعەتی بە دڵەوە بەستۆتەوە((لقد رضي الله عن المؤمنين اذ

يبايعونك تحت الشجرة فعلم مافي قلوبهم../الفتح/١٨)) تەنانەت لە ئیسلامدا بەیعەتی کارو تێکۆشانیش هەیە ( تبايعوني على السمع والطاعة.....وعلى الامر بالمعروف و النهي عن المنكر... تا كۆتايي فەرموودەكە/ ) لە مجۆرە بەیعەتەشدا (بوونی توانست)بەمەرج گیراوە لە جێبەجێکردندا (عن ابن عمر قال: كنا اذا بايعنا رسول الله - ص - على السمع والطاعة، يقول لنا: فيما استطعتم/ متفق عليه).

لە بارەی گەورەیی پەیمانەوە لە باسی ئیمانـدا، خوداوەنـد دیمەنێکی غەیبانیی لە شێوەی (گفتوگۆیەك)دا نیشاندەدات ـ لە كاتێكدا كە هێشتا نەوەكان لە پشتی باوكیاندا بوون ـ پرسیاری لێكردوون: ((الست بربكم ؟ قالوا بلى ..الاعراف/١٧٢)) ئەم دیمەنە ـ كە دیارە بە چاوی سەرو بە عەقڵی رووت ناخوێندرێتەوە ـ ئەگەر نەشبوایە خودا هەر دەیتوانی باوەڕ بخاتە دڵەوە، بەڵام دەیەوێ بیرمان بخاتەوە كە خۆمان بە زمانی حاڵ و هەر بە فیترەت پەیمانمان پێداوە كە ئێمەی مەخلوق دەبێ خالیقێكمان هەبێت، هەر بۆیە دەبینین وەزیفەی پێغەمبەرانیش(س) بەر لەهەرچی (بیرخستنەوە)، دەتوانین بڵێین بیرخستنەوەی ئەو پەیمانە بووە((فذكر انما انت مذكر، لست عليهم بمسيطر/الغاشيه/٢ ـ٢٢)) ـ وەك دوایی دەچینەسەری ـ

ئیدی چەمکی بەیعەت و بەڵێن و پەیمان لە ئایینەکاندا و لە قورئـان و سـوونەتەدا، ڕوویەری تایبەت بـە خـۆی هەیـە، ئایەتەکانی (المائدة/١، الاسراء/٣٤ ، النحل/٩١، البقرة/٢٧/٣٦/١٧٧، الرعد/٢٥..) لە نموونەی ئەو ئایەتانەن کە باسی بەڵێن و بەیعەت و پەیمانشکاندنیان لە خۆگرتووە.

وەك گوتمـان خـوای گـەورە پـەیمانی لـە مـرۆڤ ـ بـە گـشتی ـ وەرگرتووە، پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرتـووە (( واذ اخذ الله میثاق النبیین/ال عمران/٨١))..، پێغەمبـەرانیش(س) پـەیمانیان لـە شـۆنکەوتووانیان وەرگرتـووە، خەلیفـەکانی راشـیدین(خ.ر) هـەروەها هـەم بـەڵێن و پەیمانیانـداوە هـەم لـە خـەڵکیان وەرگرتـووە..بەیعـەت یـان بـەڵێن و پـەیمانیش پێوەنـدییان بـە هەڵبژاردن و بڕیاری زاتیەوە هەیە.

جا ئەك بۆ کایەیەکی گەورەی وەك ئیمان کە پێوەندیی بە تەواوی ژیانی مرۆڤەوە هەیە، پێوەندیی بە دونیـا و قیامەتیـەوە هەیە (ئیمان بـە خـودا و بـە پێغەمبـەرانی و پەیامـەکانیان و بـە ڕۆژی دوایی و بە قەزا و بە قەدەر)، (ئیمـان شەسـت و ئەوەنـدە لقـە کـە زۆربـەیان کـردەیین وەك حەدیـسی سـەحیح ڕوونیکردۆتەوە) زۆرلێکردن بۆ شتی دیکەش لە ئاییندا دروست نیـە، ئیـسلام ئەك بـۆ بـاوەڕ هێنـان زۆر ناکات، بـەڵکو ئەرکـە ڕۆژانەکانی وەك خوێندنی ویرد و کردنی نوێژ و گرتنی ڕۆژووش"

توانــــستیان بـــۆ کراوەتـــــە مـــــەرج و دەبـــێ بــــە شــــەوق و تامەزرۆییــشەوە، بــە نیــەتی دروســـت( ئــیخلاص) و عیــشق و خوشووعیشەوە باوەڕدار لەگەڵیان بژی، مرۆڤ ئەگەر بە غەفڵەتی دڵەوە نوێژ بکات، یان نوێژەکەی سێبەرێك جێنەهێڵێ، نیشانەی لاوازیی باوەڕە (( فویل للمصلین الذین هم عن صـلاتهم سـاهون/ الماعون/٤ ـ٥))، یان دەبینین لە کاتە نائاساییەکاندا ئەرکـەکانی پەرستش سـووك دەبـن، چـونکە خـودا دەیـەوێ بـەبێ بیـانوو بپەرستێ، وەك دەزانین چەندین دەقـیش بـاس لـە ئاسـانکاریی دەکەن: ((یرید الله بکم الیسر ولا یریـد بکـم العسر/ البقـرة/ ١٨٥ )) وەك ســوککردنی نوێـژو نـەگرتنی رۆژوو لـە سـەفەرو کـاتی نەخۆشـیدا، واتــە خوداوەنــد نایــەوێ ئەرکــەکان قورســییەکی وەهایـان تێدا بێـت لـە توانـا بـە دەر، یـان زۆر لـە خـۆکردنێکی نێـوەکیی و زاتییـشیان پێـوە دیـار بێـت چـجای زۆرلێکردنـی دەرەکیی.

تەنانەت ئەگەر کەسانێکیش ویستبێتیان زۆر لـە خۆیـان بکـەن و ئاین لەسەر خۆیان قورس بکەن، قورئان و حەدیس بە چـەندین دەق رێگەیان لەوە گرتووە:

ـ ((یـا ایهـا الـذین امنـوا لا تحرمـوا طیبـات مـا احـل الله لکـم /المائدة/٨٧)).

- ( ما بال اقوام قالوا كذا و كذا، اما والله فانی اخشاكم لله و لتقاكم لله، لكنی اصوم و افطر و اصلی و ارقد و اتزوج النساء ..فمن رغب عن سنتی فليس منی/ )

ئاسانكاری(تیسیر) و بەمەرجگرتنی توانبست لە ئەنجامدانی ئەرك و فەرمانـدا بنەمايەكی قورئانيـە، پێوەنديشی بە رەحمانیـەت و رەحیمیـەتی خوداوەنـدەوە هەيـە بەرانبـەر بـە بەنـدەكانی، پێغەمبـەری ئیسلامیش(د.خ) هەمیشە ئاسانكار بووە.

لە چەند ئایەتێكیشدا لەبەرچاوگرتنی توانست بـە گشتی(( لا نكلف نفسا الا وسعها/الاعراف/٤٢))، لە سوورەتەكانی ( البقرة، الانعام، المؤمنون)یشدا، ئاماژەی پێكراوە.

ئەگەر كەسێك بەزۆر گوناهێكی پێبكرێ، یان بە نەزانین بكەوێتە هەڵەیەكەوە، یـان لـە غەفڵەتی دڵدا ئـەركێكی ئـایینی لـە دەستدەربچێ، بە تـاوان لەسـەری نانووسرێ، پێغەمبـەر(د.خ) فەرموویەتی: ( ان الله تعالی وضع عن امتی: الخطا والنسیان وما استكرهوا علیە /صحیح الجامع/١٨٣٦ ) هەروەها وەك چۆن نابێ كەس ناچار بكرێ بۆ ئیمانهێنان، ئەگەر موسڵمانێكیش ئاچاركرا - بە زمان - واز لە باوەڕەكەی بهێنێ، بەڵام دڵی نەلەخشا، ئەوە لێناگیرێ((من كفر بالله من بعد ایمانه الا من اكره و قلبه مطمئن بالایمان... /النحل/ ١٠٧))..

له سەروو هەموو ئەمانەشەوە، مرۆڤ هەر خۆی وەها خوڵقاوە هەم بارەڕداری تێدا بێت هەم بێباوەڕ، نە فریشتە بێت و نە شەیتان، هەم گوناهبار و تاوانکارو هەم تەوبەکاریش بێت. ئەگەر ژیانی مرۆڤ خاڵیی بوو لە تاوان و هەڵە، ئەوە دەرچوونە لە جیهانی مرۆڤ وخوای گەورەش جیهانی وەهای ناوێت و دەیگۆڕێت ـ وەك فەرموودەی قودسیی ئاماژەی پێکردووە(لولا انکم تذنبون لخلق الله تبارك و تعالی خلقا یذنبون فیغفر لهم/ صحیح الجامع/٥٣٠٥).. ئاخر خوداوەند مرۆڤی بۆ بەندایەتیەکی ئازادانە خوڵقاندووە نەك بەندایەتیەکی فریشتانە و بەبێ ئیرادەی خۆی.

جا دروستبوونی ئیمان و ژیانی ئاینداریی و پابەندبوون بە پەرستش و ئەخلاقەوە بەم تەرزەو لەسەر ئەو بنەمایانە، نەك پێوەندی بە سەپاندنەوە نیە بەڵکو پێوەندی بە عیشق و مەحەبەتەوە هەیە...،مرۆڤ ئەگەر بە خولستی خۆی ئیمانی نەهێنا، مەلائیکەشی بۆ بێتەخوارێ و موعجیزەشی پێشچاوبخرێ، نایهێنێ(( ولو اننا نزلنا الیهم الملائکة و کلمهم الموتی و حشرنا الیهم کل شیء قبلا..، ما کانوا لیؤمنوا الا ان یشاء الله و لکن اکثرهم یجهلون/الانعام/١١١)).

پاش ئەمانە دەبێ ئەوەش بە بیر بهێنینەوە کە چەمکی (ئیمان) لە زمانیشدا پێوەندی ریشەیی بە وشەی( ئەمن و

ئەمان، نەبوونی ترس، گەیشتن بە رووناکیی و دڵنیایی )یەوە هەیە و...،(اسلام) یش پێوەندی بە سەلامەتبوونەوە هەیە( سەلامەت بوون بە هەموو ماناکانی، سەلامەت بوون لە ئافاتی شیرك و دووڕوویی - وەك چەند سەرچاوەیەك و عەللامەی شەهیدیش مامۆستا ناسری سوبحانیی لە باسی (بەندایەتی و خواناسیی) و تەفسیری سوورەتی (یونس)دا ئامارەیان پێکردووە، هەروەها سەلامەت بوون بە مانای گرتنەبەری ڕێگەی نوور و ڕێنمایی و ئاشتی ((... قد جائکم من الله نور و كتاب مبين، يهدى به الله من اتبع رضوانه سبل السلام و يخرجهم من الظلمات الى النور باذنه و يهديهم الى صراط مستقيم/ المائدة/١٥/١٦)).((الذى اطعمهم من جوع و امنهم من خوف/قريش/٤)).

ئیمانهێنان و پابەندبوون بە ئیسلامەوە، ئەگەر بە زۆر و بە سەپاندن بێت، ئیدی هیچ مانایەك بۆ هەڵبژاردنی ڕێگەی ژیان و بەرپرسیارەتی و پاداشت و سزای ڕۆژی قیامەت نامێنێتەوە، مانایەك بۆ ئەو ئازادییە نامێنێتەوە کە مرۆڤ لەگەڵ لەدایکبوونیدا پێیبەخشراوە، ئاخر گوتە بەناوبانگەکەی عومەری کوڕی خەتتاب(خ.ر)" متى استعبدتم الناس و قد ولدتهم امهاتهم احرارا" بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی ئازادی هەر لەگەڵ لە دایکبوونی مرۆڤدا دەبێت بە ماف.

**ئیمان و جەنگ...ئیسلام و دامودەزگای سەربازی:**

پێکهێنانی سوپاو دامودەزگای سەربازیی لەسەردەمی دەسەڵاتی پێغەمبەردا (د.خ)، پێویستیەکە زەمینەی تایبەتی بۆ سازاوە و پەیوەندی بە دروستبوونی قەوارە و دەسەڵاتی بەڕێوەبردنەوە هەیە نەك سەپاندنی ئیمان، تا دەسەڵات لە فۆرمی چەند شێوە دەزگایەکی ئەو کاتەدا دروست نەبوو، هێزی چەکداریش وەك سوپا بوونی نەبوو، هێزی بانگەوازی حەکیمانە تاکە هێزبوو، پاش ئەوەی لە مەدینە کاروبارەکان بەو فۆرمەی ئەو دەم بە دەزگایی کران، پێوەندیەکانی نێوان موسڵمانان وخاوەن ئایینەکانی دی بە پێی شێوە دەستوورێك رێکخران" ئیدی جۆرێك لە قەوارەو دەسەڵاتی سیاسی وبەڕێوەبردن... پاشان سوپاش بۆ پاراستنی مەدینە و ئەو قەوارەیە دامەزرا، دیارە مەبەستی موسڵمانان لە پارلستنی مەدینەدا پاراستنی ئیمان و گیان و کەرامەتی خۆیان و خەڵکی شارەکە بوو، بەو مەبەستەش کە ئەو کەشوفەرا و هەلومەرجە نوێیە بکرێتە سێبەرێکی ئازادیی بۆ بانگەوازو زێتر بڵاو بوونەوەی ئیسلام و فرەوانکردنی بنکەی ئەو قەوارەیە.

ئیمان و ئیسلام بەر لە هەرچی پێوەندی بنەڕەتیی و هەمیشەییی بە بانگەوازەوە هەیە، لە مەدینەش بانگەواز وەك

بنەمایەك مایەوە، بەڵكو بازنەكەشی فـرەوانتر بـوو، زۆر فرەواتـر لە كێڵگەی بانگەوازی شاری مەككە، حوكمی ئایەتی بانگـەواز (( ادع الى سبيل ربك بالحكمة و الموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هـي احسن / النحل/ ١٢٥)) نەك هەر نەسـخ نـەبۆوە، بـەڵكو كۆمـەڵێ ئایەتی دیكەشـی هاتـە پـاڵ بـۆ گفتوگۆ لەگـەڵ خـاوەن پەیامـە ئاسمانیـەكانی دی و پێكـەوە ژیـان و دروسـتكردنی پێوەنـدی كۆمەلآیەتی، وێرای پاراستنی مافە گشتیەكانیان - وەك دوایی لە باسی ئایینەكاندا دەچینە سەری - .

هێزی چـەكدار ئـەگـەر پـێش مەدینـە و پـێش ئـەو پێشكەوتن و پێگەیشتنە لـە رووی رێكخسـتن و بەرێوەبردنـەوە، لـە مەككـە پێكبهاتایە - بـەبێ بـوونی دەسـەلات و سـەروەریەكی گـشتیی - وەك شـەهید سـەید قوتـب لـە پێشەكی تەفـسیری سـوورەتی ئەنفالـدا باسـیكردووە - جۆرێك لە جـەنگی ئـەهلیی و تەنانـەت جەنگی نێو خێزانەكانی بەرهەم دەهێنا.

راستە لـە مەككەشـدا باوەڕدارەكـان - بـە ئامـاژەی قورئـانیی - بۆیان هەبوو بۆ تۆڵەئەستاندنەوە پـەنا بـە هێـز بـەرن( هێـز بـە هەموو جۆرەكانیەوە) بەلآم سەبرگرتن باشـترو لـە پێشتر بـوو(( وان عـاقبتم فعـاقبوا بمثـل مـا عـوقبتم . و لان صـبرتم لهـو خـير للـصابرين/النحـل/١٢٦)) بێگومـان دەبـوو تۆڵەئەسـتاندنەكە بـە ئەندازەی ئەو ئازارو سزایەش بوایە كە چێشتوویانە، لەگەڵ ئەو

رێگە پێدانەشدا قورئان لەو قۆناغەدا هەرسەبرگرتن بە دروستتر دەزانێت، بە تایبەت بۆ خودی پێغەمبەر (د.خ)، ئەوە هەر نەدەبوو بەرلنبەر بەو ئەشکەنجەدانەی کە رووبەڕووی دەبۆوە بێجگە لە چەکی قورئان و رێنمایی، خودی خۆی هیچ جۆرە کاردانەوەیەکی دیکەی هەبوایە ((واصبر وما صبرك الا بالله ولا تحزن عليهم ولا تك فى ضيق مما يمكرون/النحل١٢٧"٩".

بۆیە بوونی هێزی چەکدار لە سایەی دەسەڵات و قەوارەکەی مەدینەدا بەرهەم هات و تاسەردەمی خەلافەتی عوسمانییش، هەر لە سایەی قەوارە و بوونی جۆرێك لە دەوڵەت و سیادەتدا سوپا بوونی هەبووە و رۆڵی بینیوە.

بێگومان ئەمەش مافێکی ئاسایی هەموو دەوڵەت و دەسەڵات و قەوارەیەکە، لەم رۆژگارەشدا دەوڵەتان، لە پێشیانەوە دەوڵەتانی لیبراڵ و دیموکراسی و پارێزەری مافی مرۆڤ خاوەنی جبەخانە و چەك - چەکی کۆکوژیش - خاوەنی سوپای زەبەلاح و هێزی ئاسمانیی و زەمینیی و زەریایین بۆ پاراستنی بەرژەوەندێکانیان، لەکاتێکدا لەم رۆژگارەدا بانگێشەکانی مەدەنیەت و کەرەستەکانی گفتوگۆو کەناڵەکانی پێوەندیکردن و راگەیاندن، بەکجار زۆرو جۆراوجۆرن، بە پێی زۆریی و جۆراجۆریی ئەو کەناڵانەی پێوەندیکردن و گفتوگۆو گەیاندن و ئەو رۆشنبیرییەی لە بواری مافی مرۆڤ و ئازادیەکان و دیالۆگدا

هاتونە ئاراوە، دەبوو لە دونیای نوێدا زمانی چەك بەو گەورەییە ڕۆڵی نەبوایە.

لە چوارچێوەی قەوارە و دەسەڵاتی سیاسیدا لەهەر سەرزەمینێکدا بێت، موسڵمانان مافی خۆیانە خاوەنی هێز بن، بەڵام بێگومان بەمەبەستی بەرگری لە خۆکردن و ترس خستنە بەر نەیارانی دوژمنکارو پوچەڵکردنەوەی خەون و خەیاڵی هێرشکردنە سەر قەوارەکە و داگیرکاریی، نەك بۆ سەپاندنی ئیمان((و اعدوا لهم ماستطعتم من قوة و من رباط الخيل ترهبون به عدوالله و عدوكم والخرين من دونهم لا تعلمونهم الله يعلمهم /الانفال/٦٠)).

وەك چۆن هەموو فەریزەکان پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە کاتی تایبەتی خۆیانەوە هەیە، یان زۆربەی ئایەتەکان زەمینە و کات و بۆنەی تایبەتی دابەزینیان هەیە، جەنگیش هەروەها کات و زەمینەی تایبەتی خۆی هەیە، هەموو دەوڵەت و قەوارەیەکیش خوێندنەوە و ئامادەسازیی تایبەت بۆ حاڵەتی نائاسایی و کاتی جەنگ دەکات.

ئەگەر حاڵەتی جەنگ - وەك جۆرێك لە جۆرەکانی جیهاد - حاڵەتێکی کاتییە، تێکۆشان( بە مانا فرەوانەکەی) و بانگەوازکردن بۆ ئیمانهێنان دەبێ پرۆسەیەکی بەردەوام بێت لە هەموو کاتێکدا، تەنانەت لە کاتی جەنگیشدا، وەك لە

راسپاردەکانی پێغەمبەردا بۆ سەرکردەکانی سوپا ئاماژەیان پێدەکەین کە دەبێ بەر لە جەنگ و تا کاتی دەستکردنەوەی بەرانبەرەکان،گفتوگۆو داوای هیدایەت هەبێت، لە راستیدا ئەگەر ناچاریی نەبولیە، ئیسلام هیچ پێویستیەکی بە جەنگ نەدەبوو.

مەبەستی ئیمان (هەر لە خۆیدا) رزگار بوونە ونامادجی شەریعەتیش لە بنەمادا پاراستنی (( دین و ژیان وعەقڵ و وەچەو ماڵ و ئابڕوو))ە، دەنا تاوانی کوشتن بە گشتیی لە حەرامە هەرە گەورەکانە((... انه من قتل نفسا بغير نفس او فساد في الارض فكانما قتل الناس جميعا، ومن احياها فكانما احيا الناس جميعا /المائدة/ ٣٢))... شەهید ناسری سوبحانیی دەڵێت:" ئەگەر بانگەواز بە بێ کوشتار و جەنگ بکرێت، هیچ کەمیوکوڕیەك ڕوو ناکاتە کاری بانگخواز"١٠".

نەك خوێنڕشتن، ئەشکەنجەدانیش ــ با لەسەر حەقیش بێت ـ سزای زۆر توندی لەدولیە: (اشد الناس عذابا للناس في الدنيا اشد الناس عذابا عند الله يوم القيامة/صحيح الجامع٩٩٨).

نەك هەر ئازاردانی مرۆڤ، ئیسلام ڕێگەی لە ئازاردانی گیانلەبەرانی دیکەش گرتووە.

بەرگری چەکدارانەی موسڵمانانیش -وەك دوایش دەچینە سەری - پاش دەسپێشخەریی ئەوان((و هم بدئوكم اول مرة/ التوبة/١٣)) پاش هەڕەشەی گرتن یان کوشتن و دەرکردنی

پێغەمبەر((واذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك او يقتلوك او يخرجوك /الانفال/٣٠))، پاش دەرکردنی باوەڕداران بوو لە مەککە((اذن للذين يقاتلون بانهم ظلموا، وان الله على نصرهم لقدير... الذين اخرجوا من ديارهم بغير حق الا ان يقولوا ربنا الله، ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع و بيع وصلوات و مساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا، واخراج اهلها اكبر/ الحج/ ٣٩ــ٤٠ ))، وەك لەم ئایەتەدا دەرکەوتووە موسڵمانەکان ستەمیان لێکراوە، لە وڵات وەدەرنراون، بێجگە لەوەی کە گوتوویانە (الله) پەروەردگارمانە هیچ (تاوان!)ێکی دیکەیان نەبووە.

بێگومان بەرگریە چەکدارانەکەش لە پاش کۆچکردن و دروستبوونی قەوارەوە کراوە، کۆچکردنیش بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، پێش کۆچکردنی گەورە بۆ مەدینە، کۆچ بۆ حەبەشە و پاشان تایف کراوە، هەر یەکە لە کۆچکردنەکانیش تایبەتمەندیی خۆی هەبووە، کۆچکردن بۆ مەدینەش زەمینەسازییەکی زۆری بۆکراوە و ئیمانداریی رووبەرێکی هەرە زۆری مەدینەی داپۆشیوە و ئەهلی کیتاب و موشریکان لەوێ دەسەڵاتی ئایینیانەیان رووی لە لاوازیی کردووە، ئەوجا فەرمانی کۆچکردن هاتۆتە خوارێ، پاش هەموو ئەوانەش ئەوجا ئامادەییەکان بۆ بەرگری چەکدارانە زەمینەسازییان بۆ کراوە.

زانای هەڵکەتووی کورد شەهید مامۆستا ناسری سوبحانیی زۆر بە وردیی ئەم لایەنی ستەمکاریی و دوژمنکارییەی لە بابەتی(قتال)دا و قۆناغەکان و شێوازەکانی بانگەواز و زەمینەسازیی بۆ کۆچکردن، روونکردۆتەوە"١١".

جەنگ ـ لە هەلومەرج و کاتی خۆیدا ـ لە روانگەی ئیسلامەوە ئامانجێکی ئینسانیی هەیە و لە خزمەتی پێنج ئامانجەکەی شەریعەتدایە، نەك هەر سەرکەوتن لە جەنگدا بەڵکو گەیشتنیش بە دەسەڵات و (تەمکین) لە پێناو ئامانجی بەرزی ئینسانیی و ئاوەدانکردنەوەدایە نەك بۆ ستەمکاریی و خۆسەپاندن(( الذین ان مکناهم فی الارض اقاموا الصلاة و اتوا الزکاة و امروا بالمعروف و نهوا عن المنکر../الحج/٤١))، پاشان یەکێك لە بەرهەمەکانی باوەڕداربوون وچاکەکاریی، گەیشتنە بە دەسەڵات و رەوینەوەی ترس لەسەر ژیان (( وعدالله الذین امنوا منکم وعملوا الصالحات لیستخلفنهم فی الارض ولیبدلنهم من بعد خوفهم امنا/النور/ ٥٥ ))نەبوونی (ترس) کە پێویستیەکی دەروونیی و کۆمەڵایەتی مرۆڤە، خوای گەورە بە یەکێ لە نیعمەتەکانی خۆیی دەزانێ (( وامنهم من خوف/ القریش/٥ ))، باوکی پێغەمبەرانیش(ئیبراهیم ـ س) کە لە خودا دەپاڕاوە، دوعای دەکرد خاکی وەحیی و ئایینی نوێ، شوێنێکی ئەمین و پڕ لە ئارامیی و بێترس بێت (( رب اجعل هذا البلد امنا/ابراهیم

/٣٥ )) - وەك لەسەرەتاشەوە گوتمان - وشەی ( ئەمن) بێگومان پێوەندییەکی راستەوخۆی بە وشەی (ئیمان)ەوە هەیە و ئیمانیش بە گشتی چ لەسەر ئاستی تاك و چ لەسەر ئاستی کۆمەڵ، سەرچاوەی ئارامیی دەروونیی و کۆمەلایەتی و بەرهەمهێنەری ئەخلاقی بەرزە.

وا چووینە سەر ئەو بۆچوونە و گوتمان ناپێن لە مەدینە و پاش دروستبوونی قەوارە و دەسەلات، بەزۆر و هەروەها بە پالنەری غەنیمەت - وەك دەگوترێ - بلاو بۆوە و سەپێنرا، ئاخر هێندێ کەس بۆچوونیان وەهایە، ئەو زۆر نەکردنە تەنیا لە مەککەدا بووە((لكم دینكم ولي دین )) بەلام دوایی کە ئیسلام بە دەسەلات گەیشتووە" دەزگای سەربازیی بۆ (باوەڕ بە خەلك هێنان و موسڵمانکردن) پێکەوە ناوەو زەبروزۆری نواندووە..، ئەی لە قۆناغی نهێنیدا لە مەککە چۆن ئەو بناغە پۆلایینەی ئیمان دارێژرا؟ موحەممەد(د.خ) سەرەتا و پاش گەڕانەوەی دواجاری لە ئەشکەوتی حیرا - کە خۆیشی پێویستی بە دڵنەواییکەرێك هەبوو، تا ئەوکاتەی خەلك تاك تاك موسڵمان بوون، بێجگە لە هێزو دەسەلاتی رۆحیی و حەقویستی و پشتبەستن بە خودا، چ هێزو دەسەلاتێکی دیکەی هەبوو؟! خەدیجە و ئەبووبەکرو عومەر و عەلی و عوسمان و سومەیە و یاسر(س) بە چ زبری و زەبرێ موسڵمان بوون ؟ یەکێکی وەك بیلال حەبەشیی - بە

پێچەوانەوە ـ زۆری لێدەکرا لە ئیسلام پاشگەز ببێتەوە، دەنا خۆی ئیمانی بە رزگارکەر دەبینی. نەك لە ترسان یان بۆ مەرامی تایبەت، بەڵکو ئەوان ئامادە بوون ئەوەی هەیانە لە سەرو لە ماڵ، لە پێناو پاراستنی ئیمانەکەیاندا بیبەخشن.

لە قۆناغی بانگەوازی مەککەدا موسڵمانان نەك زۆریان لەکەس نەکرد بۆ باوەڕهێنان، بەڵکو خۆیان لە ژێر باری ئەشکەنجە و زۆرلێکردنـدابوون بـۆ پاشـگەزبوونەوە و گەڕانـەوە بـۆ سـەر وەسەنیەت و نەریتەکانی جاهیلیەت..، تەنانەت توندی و تیژی بەرانبەریان گەیشتە ئەوەی لێشیان شەهیدکرا (خاتوو سومەییە لەو شەهیدانەی قۆناغی مەککەیە کەبەرنووکی رمی رق و قینی خودی ئەبوجەهل دەکەوێت ).

لە راستیدا لـە مەککەش ئـەوە کافرەکـان بـوون دلوایـان دەکـرد موحەممەد و هاوەڵانی(س) ماوەیەك بچنە سەر ئایینی پەرستنی بتەکانیان، تـا ئـەوانیش ماوەیـەك خوداکـەی ئـەمان بپەرسـتن ـ وەك لە سـەرەتای سـوورەتی (الکـافرون)دا دیـارە ـ کـە وەڵامـی خودایە لەسەر زمانی پێغەمبەر (( قل یا ایها الکافرون لا اعبد مـا تعبدون)) دەنا ئیمانهێنان شتێك نیە تەنیا پێوەندی بە قۆناغێـك لـە زەمەنـەوە، بـە مەککـە و بـە مەدینـەوە هـەبێت، ئـەی پـاش گوزەشتنی ئەو زەمەنە، ئەی لەم سەردەم و رۆژگارەدا کە باسی قۆناغی مەککە و مەدینە لە ئارادا نیە؟ باوەڕهێنـان لـە هـەموو

قۆنـاغ و زەمەنێکـدا هـەردەبێ بـە خواسـت و ئـارەزوو، بـە رازیبوون و بە یەقین، لە دڵدا سەوز ببێ و پاشانیش بەرەبەرە پەلوپۆ بهاوێ.

لە قۆناغی مەبینەشدا، باوەڕهێنان نـەك بـە زۆر نـەبوو، بـەڵکو ئامـانج لـە کۆچـکردن لـە مەککـەوە بـۆ مەدینـە لـە خۆیـدا بـۆ دەربازکردنی ئاین و ئیمان بوو، بۆ خۆپاراستن بوو لە توندی و تیـژی، لـە مەدینـە ئـاین نـەك هـەر نەسـەپێنرا، بـەڵکو لـەوێ دیارترین ئایەت لە بارەی ئـازادیی ئایینییـەوە هاتـە خـوارێ ((لا اکراه فـي الـدین../ البقـرە/ ٢٥٦)) لـەوێوە بنـەماکانی ئـازادیی ئـایینی و پێکـەوە ژیـان بەرەبـەرە رەنگیاندایـەوە. هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایەتەکەش روونە "دوو کوڕی ئەنسارییەك چووبوونە سـەر ئـایینی نەسـرانیەت، باوکەکـە ــ وەك بـۆ پێغەمبـەری دەردەبڕی ـ زۆر لەسەر دڵی قورس ببوو، دەیویست پەشیمانیان بکاتەوە، ئیدی ئەو ئایەتە هاتە خوارێ".

هەروەها هـەر لـە مەدینـە و لـە کـاتی پێگەیشتن و بـەهێزبوونی دەسـەڵاتی ئیـسلامیدا بـوو( پـاش رێکەوتننامـەی حودەیبیـە و پێش ئازادکردنی مەککە) کـە پێغەمبـەر(د.خ) نامـەی بانگـەواز و داوەتکردنـی دەنـارد بـۆ پاشـایانی دەوروبـەر(پاشـایانی وڵاتـی فـارس و رۆم و میـسر و یەمـەن و ...) بـۆ وەرگرتنـی ئـایینی ئیسلام، کە بێگومان نامەکانی رەحمەتی ئیسلامیان لێدەچۆڕا،

بەڵام ئەوە هێندێك لەوان بوون كە لە تووڕەیی و هەڵچووندا، نامەكانی ئەویان دەدڕاند و جاری وەهاش هەبوو نوێنەرەكەیان دەكوشت..

پاشای وڵاتی فارس نەك هەر نامەكەی دڕاند بەڵكو لە یەمەنەوە دوو كەسی بە هەڕەشەوە ناردە سەر پێغەمبەر(د.خ)، بەڵام كە نوێنەرەكان گەیشتنە لای موسڵمان بوون و لە رێگەی ئەوانیشەوە خەڵكێكی زێر دەسەڵاتی فارس موسڵمان بوون، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەوان سووكایەتی بە موسڵمانان بكەن و جاروباریش پەلاماریان بدەن...، پاشای وڵاتی رۆمیش كە نامەی پێغەمبەری پێگەیشت، هەستی كرد كەسانی دەربار و دەستوپێوەندی پێی رازیی نین، رازیی نەبوونەكەشیان چەكەرەكردنی هەستی دوژمنكاریی لەدوا بوو بەرانبەر بە موسڵمانان، میری وڵاتی دیمەشقیش كە نامەی پێگەیشت، وەڵامی نووسراوەكەی خۆ تەیاركردن بوو بۆ جەنگ..، هەروەها پاشای غەساسینە ـ پاش سووكایەتی پێكردن ـ یەكێك لە نێردراوانی پێغەمبەری كوشت كە بەرێوە بوو بۆ لای میری شاری (بەسرا).

ئەگەر بچینە نێو دەقی نامەكانیشیەوە دەبینین بەوپەڕی هەست كردن بە بەرپرسیارەتیەوە( بەرپرسیارەتی پێغەمبەرانە)، بەوپەڕی رێزەوە بۆ بەرانبەرەكان و بە

لەبەرچاوگرتنی پایەیان نامەکانی نووسیون، واتە بەبێ هیچ ئاماژەیەکی نیەتی سەپاندن، تەنانەت بەبێ هیچ بۆن و بەرامەیەکی فیزکردن و خۆ بەگەورەزانین و بەکەم سەیرکردنیان با پێغەمبەریتیش بەرزترین پایەیەك بێت کە مرۆڤ پێیبگات..، با بە نموونە سەیری نامەکەی بۆ پاشای ولاتی رۆم بکەین:

ـ (بسم الله الرحمن الرحيم..من محمد عبدالله ورسوله الى هرقل عظيم الروم..

سلام على من اتبع الهدى..اما بعد: فاني ادعوك بدعاية الاسلام، اسلم تسلم..يؤتك الله اجرك مرتين..فان توليت فان عليك اثم الاريسيين..و((.. قل يا اهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا و بينكم ....تا.. فان تولوا فقولوا اشهدوا بانا مسلمون/ال عمران/٦٤))/بوخاری و موسلیم).

پاش ئازادکردنی مەککەش کە دەسەلاتی ئیسلام زۆر زۆرتر هەلکشا و فرەوانتربوو، پاش گفتوگۆی حەزرەت لەگەل دەمراستانی تیرە و هۆزەکانی دەوروبەر، ئەولنیش لەو سالەدا کە بە (سالی وەفدەکان) ناسراوە، دەهاتنە لای پێغەمبەر و موسلمانەتی خۆیانیان رادەگەیاند، دوای هاتنی نێردەی هۆزەکانیش، پێغەمبەر (د.خ) کەسانی شارەزای دەنارده ناوچەکانیان بۆ ئەوەی ئیسلامەتیان بۆ روون بکەنەوە..، روونکردنەوەکە دەبوو لە ئیمانەوە دەست پێبکات، پاشان

پەرستشەکان و شتی دی... ، ئەویش بە حیکمەت و نەرمی و نیانیەوە، کە دوور نوێنەری خۆی بۆ یەمەن ناردن، رایسپاردن کە ئاسانکار و مژدەدەر بن نەك سەختگیر و پرینگێنەر (یسرا ولا تعسرا، بشرا ولا تنفرا، و تطاوعا/بوخاری).. تەواوی ئەم راستیانەی سەرەوە لە زۆر لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلامدا(د.خ) تۆمارکروان"١٢".

**ئایینەکانی پێش ئیسلام ... بانگەواز یان جەنگ:**

بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئامانجەکانی بانگەوازی ئیسلام و سروشتی کارکردنی، دەبێ بگەرێینەوە بۆ ئایینە ئاسمانیەکانی پێشوو، چونکە ئەوانیش بانگەوازی خودان و بۆ مەبەستی هیدایەت هاتوون و هەموو تەواوکەری یەکدین.

وەك دەزانین ئەو ئایینانە زۆریەیان کەنالی گەیاندنیان زمانی گفتوگۆ نواندنی موعجیزە بووە، ئەگەرچی مەبەستی موعجیزەش ـ وەك زانا و عاریفی گەورەی کورد سەعیدی نورسی روونیکردۆتەوە ــ بۆ ئەوە نەبووە کە خەڵك ناچاری ئیمانهێنان بکرێت"١٣" ..موعجیزەی هەرە گەورەی ئەوان ئەخلاق بووە ـ وەك لە وتارێکی تایبەتدا باسمانکردووە ـ ."١٤"

لە راستیدا ئەخلاقی بەرزی ئاسمانیی و بێوێنە و سەرمەشقبوونی ئەوان لەهەموو روویەکەوە، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بانگەوازی پێغەمبەران بانگەوازی رێنمایی و خەڵك شوێن حەقیقەت و ئەخلاق خستن بووە نەك سەپاندن.

ئەگەر سەپاندن شێوازی بڵاوکردنەوەی ئایین و ئیمان بوایە، دەبوو حیکمەت و راستگۆیی و نەرمیی و نیانیی و سەبرگرتن و زۆر خەسڵەتی دی، بەو گەورەیی و قووڵییە لە ژیانی پێغەمبەراندا بوونی نەبوایە:

قورئان پڕە لە گفتوگۆی دووروودرێژی بە پەرۆشانەی پێغەمبەران لەگەڵ بەرانبەرەکانیان ((یا نوح قد جادلتنا فاکثرت جدالنا فاتنا بما تعدنا ../ هود/٣٢))..، گفتوگۆ پڕ لە پرسیارەکانی نێوان ئیبراهیم و قەومەکەی نموونەیەکی دیکەن ((اذ قال لابیه و قومه ما تعبدون، قالوا نعبد اصناما فنظل لها عاکفین، قال هل یسمعونکم اذ تدعون، او ینفعونکم او یضرون؟؟؟!!!.....الشعراء /٦٨/٧٢ ....تا/ ٨٢ ))

پێغەمبەران(س) نەك هەر ستەم وسەپاندن لە پەیامیاندا نەبووە، بەڵکو توندی و تیژی و ستەمیشیان بەرانبەر نوێنراوە و لێشیان کوژراوە((افکلما جائکم رسول بما لا تهوی انفسکم استکبرتم ففریقا کذبتم و فریقا تقتلون/البقرة/٨٧)) زۆربەشیان لە پاڕانەوەو گفتوگۆو بیرخستنەوە زێتر، چەکێکیی دیکەیان نەبووە!

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین، دەبینین زۆریەی ئایینە پێشینەکان ـ ئەوانەی باسیان لە قورئاندا هەیە ـ چونکە قەوارە و دەسەڵاتی سیاسیان ـ بەو فۆرمەی لای ئایینی ئیسلام نەبووە، دەزگای سەربازییشیان نەبووە یان بەو گەورەییە نەبووە و هەر لە بازنەی بانگەوازدا خۆیان ئەدا کردووە، بەڵام پێغەمبەرێکی وەك داود یان سولەیمان(س) چونکە ـ وێڕای پێغەمبەرێتی ـ پاشاش بوون و دەسەڵاتێکی دەوڵەتیانەیان

هەبووە، دەبینین خاوەنی سوپایەکی ڕێکخراویش بوون، بەلام بە بێگومان لەو ڕۆژگارەشدا وەزیفەی سوپاکە هیچ پێوەندیەکی بە سەپاندنی ئیمانەوە نەبووە، بەلکو هەر پێوەندی بە ستەمکاریی و وەدەرنانەوە هەبووە لە ولات ((قالوا وما لنا الا نقاتل فی سبیل الله و قد اخرجنا من دیارنا و ابنائنا/البقره/٢٤٦)) سوپاکە نەك هەر مەبەستی سەپاندنی ئیمان نەبووە، بەلکو خۆیشی دەستەتەیەکی هەلاوێردراوی تاقیکراوەی لێماوەتەوە((ان الله مبتلیکم بنهر..فمن شرب منه فلیس منی.. ومن لم یطعمه فانه منی..الا من اغترف غرفة بیده..فشربوا منه الا قلیلا........ کم من فئة قلیلة غلبت فئة کثیرة باذن الله/البقرة/٢٤٩)).

سوپا گەورەکەی حەزرەتی سولەیمانیش(س)، هەست ناکەین وەزیفەکەی پێوەندی بە سەپاندنەوە هەبووبێت، سولەیمان کە دەیەوێ دلوای موسلمانبوون لە شاژنی ولاتی (سەبەء) بکات، نامەی بۆ دەنێرێ، نامەیەك بە (بسم الله الرحمن الرحیم)دەست پێدەکات! نامەیەك کە شاژن بە نامەیەکی زۆر ڕێزدارانە((کتاب کریم)) ناوی دەبات، ئەویش پاش ڕاوێژ کردن بە دەستوپێوەندەکەی (کە قسەیان ئەوەیە شانازیی بە هێزیی خۆیانەوە دەکەن و دەتوانن بە هێزی سوپا بەرهەلستی بکەن، بەبێ ئەوەی سولەیمان باسی هێزی کردبێ)

بەڵام ئەو خۆی ئادلتە دەست ئیز و بەخۆنازین و لە خۆرازیبـــــــــــــــــــــــــــــــــــوونی پیاوە سەربازیەکان، بە هەڕەشەی هێز وەڵام ئادلتەوە، دیاریەکی بەنرخ بۆ سولەیمان دەنێرێت، بەڵام دەشێ ئەوەش جێگەی سەرنج بێت کە ناردنی دیاریەکی ماددیی گرانبەها بۆ پێغەمبەر و پاشایەك کە توانست و دەسەڵاتێکی خەیاڵیی بێوێنەی هەبووە نەك هەر لە جیهانی مرۆڤدا بەڵکو لە جیهانی مەخلوقاتی دیکەشدا، دەبێ مانای چیبێت؟؟ دەشێ ئەو شاژنە هەڵکەوتووە ویستبێتی لەو ڕێگەیەوە بزانێ داخوا سولەیمان(س) مەبەستەکەی دینە یان دەسەڵاتخوازیی ودونیابازیی - وەك شەهید سەید قوتب لە تەفسیرەکەیدا ئاماژەی پێداوە - بۆیە ناردنی ئەم دیاریە سولەیمان تووڕە دەکات، بەڵام ئەمجاریش ئەو هەر وەڵام دەداتەوە، هەواڵ لەبارەی بەرێخستنی سوپاوە دەنێرێت، هێز و گەورەیی سوپاکەی دەردەخات، بەڵام سوپا نانێرێ، پێدەچێ سولەیمان(س) وەك پێغەمبەرێك لە ڕێگەی زانستی خوداییەوە لەو هەڕەشەی هێزو بە خۆنازینەی دەست و پێوەندەکەی ئەو شاژنەش ئاگاداربووبێت، بۆیە ئەمیش هەواڵی بەرێخستنی سوپایەکی زۆر گەورەی بۆ دەنێرێت.

دوایـی کـە بەلقیـسیش دەبرێتـەلای سـولەیمان(س)، شـێوازی بردنەکەی و بینینی کۆشکەکەی خۆی لـەوێ و بینینـی کۆشـکە بێوێنەکەی سولەیمان، دەبن بـە هۆکـاری بیرکردنـەوە و پاشـان باوەڕهێنـان، ئـەو بـۆی دەردەکـەوێت ئـەو تـوان و دارایـی و دەسەلاتەی سولەیمان(س) مرۆیی نیە و دەرلسایە، بۆیـە بـاوەڕ دەهێنێت و دەلێت((و لسلمت مع سليمان لله رب العالمين/النمـل/ ٤٤)) مـن (لەگـەلْ سـولەیماندا) خـۆم دەدەمـە دەسـت خـودای خاوەنی جیهانیان ــ نـەك دەسـت کەسـی دی ـ دیـارە منـیش و سولەیمانیش بەم هەموو دەسەلاتەشمانەوە هەر بەندەین، ئیـدی منـیش لـە نیازمەندیمـدا بـۆ خودلوەنـد وەك سـولەیمانم، ئێمـە خـاوەنی جیهـان نـین، بـەلکو ئێمـەیش و جیهـانیش خـاوەنێکی دیکەمان هەیە ! ! سـولەیمانیش لەبەرانبـەر هێنـانی موعجیزەیی بەلقیس و کۆشکەکەیدا بۆلای، سوپاسـی خوداوەنـد دەکـات کـە بـەو هـەموو تـوان و دەسـەلاتە مادییـە ئاسمانییـە پـشتیوانی لێدەکات، ئەو نیعمەتەش بە هۆکاری تاقیکردنـەوە دەزانێـت بـۆ دەرخـستنی بەندلیـەتی یـان یـاخیبوون((هـذا مـن فـضل ربـی، ليبلونی الشكر ام اكفر...ومن شكر فانما يشكر لنفسه، ومـن كفـر فان ربی غنی كريم/النمل/٤٠)) شوکرانەکردنیش بۆ خـودی مـرۆڤ خۆیەتی نەك خودلوەند پێویستی پێبێت.

لـه کۆتـایی چـیرۆکەکەدا دەردەکـەوێ، وەزیفـەی ئـەو سـوپایە شـەپاندن نـەبووە، بـەڵکو چ سـوپا و چ کۆشـك و چ دەسـەڵات بەسەر مەخلوقاتی دیکەدا، هـەموویان هۆکـارو ئایـەت و نیـشانە بوون بۆ هیدایەت.

ئەوەیشی لەپێش هـەموو ئەمانـەوە سـولەیمان(س) هـەیبووە و قورئان بە گەورە باسیکردووە (زانست)بووە(( ولقد اتینـا داود و سلیمان علما/النمل/١٥))زانستیش هۆکاری هـەرە دیاری ڕێگـەی هیدایەت و ڕێنیشاندانە.

"وەهـا دیـارە لـە شـەریعەتی بەنیئیـسرائیلدا، پێغەمبـەرێتی و(پاشایەتی ـ دەوڵەتداریی) تا سەردەمی دەرکەوتنی حەزرەتی داود (س) پێکەوە نەبووە، سیاسەتکردن و سەرکردایەتی سـوپا ئەرکی پاشا بووە، بۆیە بەنیئیسرائیل بـە پێغەمبـەرێکی خۆیـان دەگـوت ((ابعـث لنـا ملكـا نقاتـل فـی سـبیل الله/ البقـرە/ ٢٤٦ ))"١٥"

جا دامودەزگای سوپایی و سەربازیی، پێداویستیەکی دەوڵـەت و قەوارەی سیاسیە لە هەموو سەرەمێکدا.

**ئایەتــەکانی جــەنگ.. ســەپاندنی دیــن و ئیمــان یــان بەرەنگاریی ستەمکاریی:**

ئەگەر بـە وردی لـە هـەموو ئایەتـەکانی جـەنگ رامێنین" بـە ئاشـکرا دەبیـنین پێوەنـدیان بـە بـەرگرتن لـە ستەمی ئـایینی و ستـەمی (دەرکـردن)ەوە هەیـە، پێوەنـدیان بـە دروسـتکردنی کەشوهەوای ئازادەوە هەیە بۆ پاراستن و درێژەدان بە بانگەوازی، نەك سەپاندنی ئیمان (( قالت الاعراب امنا، قل لم تؤمنوا ولكن قولوا اسلمنا /الحجرات/ ١٤)) لـەم ئایەتـەدا ئـەوە بـە روونیـی دەردەکەوێ" کە دەشێ لە کاتی جەنگدا تەسلیم بوون و رازیـی بوون بە دەسەلاتی سیاسیی ئیسلام هەبێ، بـەلام ئەمـە جودایـە لە گەیشتنی ئیمـان بـە دڵ ودەروون (( ولما يدخل الايمان فـي قلوبكم)).

بۆ ئەوەی باشتر هۆیەکانی بـەرپاکردنی جـەنگیش بزانین با بـە خێرایی سەیرێکی ئەم ئایەتانە بکەین:

ـ قالوا وما لنا ان لا نقاتل في سبيل الله و قد اخرجنا من ديارنا وابنائنـا/ ..البقـره/ ٢٤٦.( ئـەم ئایەتـە ـ وەك لـە پێـشەوەش ئاماژەمـان پێکـرد ـ پێوەنـدی بـە بەنیئیـسرائیلەوە هەیـە لـە رۆژگاری دوای حـەزرەتی موسـا و کـاتی دەرکـەوتنی حـەزرەتی داود).

ـ اذن للذين يقاتلون بانهم ظلموا، وان الله على نصرهم لقدير، الذين اخرجوا من ديارهم بغير حق الا ان يقولوا ربنا الله، ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع و بيع وصلوات و مساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا، واخراج اهلها اكبر / الحج/ ٣٩ـ٤٠.

ـ و قاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا ان الله لا يحب المعتدين/البقرة/١٩٠

- ....واقتلوهم حيث ثقفتموهم و اخرجوهم من حيث اخرجوكم والفتنة اشد من القتل ، .... فان انتهوا فان الله غفور رحيم /البقرة/ ١٩٠ـ ١٩٢

ـ .... و اخراج اهله منه اكبر عند الله و الفتنة اكبر من القتل ... و لا يزالون يقاتلونكم حتى يردوكم عن دينكم ان استطاعوا/ البقرة/ ٢١٦ـ٢١٧

ـ واذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك لو يقتلوك او يخرجوك/ الانفال/ ٣٠

ـ الا تقاتلون قوما نكثوا ايمانهم وهموا باخراج الرسول وهم بدؤوكم اول مرة /التوبة/ ١٣ /١٤.

ـ اذ اخرجه الذين ثاني اثنين اذ هما في الغار/ التوبة/ ٣٩.

ـ اللذين اخرجوا من ديارهم و اموالهم..../ الحشر/ ٧/٨

- فالذین هاجروا و اخرجوا من دیارهم و اوذوا فی سبیلی وقاتلو و قتلوا لاكفرن عنهم سیئاتهم /ال عمران/ ١٩٥

- لاینهاكم الله عن الذین لم یقاتلوكم فی الدین ولم یخرجوكم من دیاركم ان تبروهم و تقسطوا الهیهم/ الممتحنة/٨)).

- ما لكم لا تقاتلون فی سبیل الله والمستضعفین من الرجال والنساء واللدان الذین اخرجوا من دیارهم / النساء٧٥/.

- وان كادوا لیستفزونك من الارض لیخرجوك منها /الاسراء/ ٧٦.

- فمن اعتدی علیكم فاعتدوا علیه بمثل مااعتدی علیكم /البقرة/١٩٤.

لە مانای ئەم ئایەتانەوە ستەمكاریی و نیەت و ویستی شەڕخوازانەی بێباوەڕان بە ڕوونیی دیارە، نامەوێ ئەو هەموو پیلانگێڕی و ستەم و دەستدرێژی و دوژمنكاریی و توندی و تیژیەی موشریكانی مەككەو مەدینە و دەوروبەری و هەوڵەكانیان بۆ كوشتنی پێغەمبەر بگێڕمەوە... پاشان شەڕفرۆشتنی فارس و ڕۆم و دواتر خاچپەرستانی سەردەمی دەوڵەتی ئەیوبی كە پێش ڕوودانی جەنگ هەبووە. بخەمەڕوو."١٦".

قورئان لە چەند ئایەتێكی دیكەدا، ڕوونترو قووڵتر نیەت و خواستی شەڕەنگێزانەی نەیارانی ئیسلامی بەرجەستەكردووە كە دەشێ ئەوە لای ئەوان ستراتیژ یان نیەتی هەمیشەیی بێت:

-لایرقبون فی مؤمن الا ولا ذمة و اولئك هم المعتدون /التوبة/ ١٠.

ـ ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم /البقرة ١٢٠/

ـ ود كثير من اهل الكتاب لو يردونكم من بعد ايمانكم كفارا، حسدا من عند انفسهم من بعد ما تبين لهم الحق فاعفوا واصفحوا حتى ياتي الله بامره .../ البقرة/ ١٠٩.

ـ اذ جائوكم من فوقكم ومن اسفل منكم واذ زاغت الابصار و بلغت القلوب الحناجر .. الاحزاب/ ١٠ (ئەم ئایەتە باس لە یەکگرتنی هێزە نەیارەکانی ئیسلام وهێرشکردنیان بۆ سەر مەدینە دەکات بەمەبەستی لە نێوبردن و سڕینەوەی ئەو قەوارەیە) .

ئەوانەی کە تەنیا ئەو ئایەتانە دەبینین کە فەرمانی جەنگیان تێدایە و بە پشتبەستن بەو ئایەتانە دەڵێن "ئیسلام ئایینی شمشێرە"، دەبێ هەردووچاویان بکەنەوە و ئەو ئایەتانەش ببینن کە باس لە رێگریی لە ئیمانهێنان و بانگەواز و لە ستەمکردن و دەرکردنی موسڵمانان وچەوساندنەوە و ئەشکەنجەدانیان و جەنگی دەروونیی دەکەن...؛ ئەو ئایەتانەش ببینن کە ئاماژەن بە نیەتی شەڕخوازانە و هەوڵی هەڵگێڕانەوەی موسڵمانان لە ئیسلام، ئەم ئایەتانە زۆربەیان هەر لەگەڵ ئایەتەکانی جەنگدان، ئەم ئایەتانە بۆ نابینرێن، ئەوانی دی بۆ

دەبینرێن وەدەکرێن بە بەڵگەی توندڕەوی و شەڕخوازیی ئیسلام و سەپاندنی ئایین و ئەرکەکانی؟!!

دەبێ ئەو ئایەتانەش ببینرێن کە باس لە پێکەوە ژیان و دادپەروەریی و خێر بۆ هەمووان ویستن دەکەن، دەبێ ئەوانەش ببینرێن کەباسیان لەپێوەندی نێوان ئیمان و دڵ و ئیمان و هیدایەتەوە دەکرد، بێگومان ئەو ئایەتانەی کە باس لە بانگەواز و ئەخلاق و سەرمەشقبوون و هیدایەت و پێوەندی ئیمان بە دڵەوە دەکەن و حوکمەکەشیان گشتی و هەمیشەییە[*] بە ژمێرە زۆر زێترن لە ئایەتەکانی کاتی جەنگ کە حوکمەکەشیان کاتیە.

دەبێ ئەوەش بیربخەینەوە کە هەرگیز( بێ ئیمانیی) بەتەنیا هۆکاری جەنگ نەبووە، ئەگەر بەرەی بێباوەڕ دەستدرێژی نەکات و ئامادەی پێکەوە ژیان بێت، دەبێ موسڵمانان نەك هەر نەجەنگێن بەڵکو چاکەکاریش بن ((لاینهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم فى الدين ولم يخرجوكم من دياركم ان تبروهم و تقسطوا اليهم..... انما ينهاكم الله عن الذين قاتلوكم فى الدين و اخرجوكم من دياركم و ضاهروا على اخرلجكم ان تولوهم ../ الممتحنة/ ٩ــ٨)).

بە سەرنجدان لەو ئایەتانە بۆمان دەردەکەوێ[*] پەنابردن بۆ جەنگ کردەیەکی هەرەمەکیانە نەبووە، بەڵکو قوناغ بە قۆناغ بووە، دوژمنەکانیش بە قۆنابەندیی گەیاندوویانەتە هەرەشەی

کوشتن و وەدەرنان، واتە پێوەندییەکی راستەوخۆی بە هەڵویستی نەیارەکانەوە هەبووە( وەك ئایەتەکان دەریدەخەن)..، وەك چۆن وەرگرتنی ئیمان و گەیاندنی قۆناغبەندیی و رێوشوێن و شێوازی خۆی هەبوو، جیهادیش (کە جەنگی چەکدارانە بەشێکیەتی) هەروەها قۆناغبەندیی هەبووە.

لە راستیدا من جیاوازییەك لە نێوان بۆچوونی ئەو هێندە کەسە ئیسلامیانەدا (ئەوانەی وا دەزانن جەنگ تاکە فاکتەری گەیاندن و بڵاوبوونەوەی ئیمان و ئیسلامە) و ئەو کەسە نەتەوەیی و بە ناوعەلمانیانەدا نابینم کە هەمان تەفسیریان بۆ بڵاو بوونەوەی ئیسلام و باوەڕپێهێنانی هەیە، واتە( بڵاوبوونەوەی ئیسلام بە شەڕ و شمشێر).

ئایەتەکانی جەنگ هیچ داوایەکیان تێدا نیە بۆ سەپاندنی ئیمان، لە پاڵ هیچکامیاندا باسی ئیمان نەهاتووە بەو شێوەیەی لەپاڵ ئایەتەکانی بانگەوازو ئەخلاق و چاکەکارییدا هاتووە، تەنانەت ئایەت نەبێ کە باسی جەنگن و باسی ئاین و ئیمانیشیان لەگەڵدا کراوە:

- و قاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين لله ..، فان انتهوا فلا عدوان الا على الظالمين/ البقرة/ ١٩٣.

( هەمان مەبەست لەئایەتی ٣٩ی سوورەتی ئەنفالیشدا هاتووە).

ـ قاتلو الذين لا يؤمنون بالله ولا باليوم الاخر ولا يحرمون ما حرم الله و رسوله ولا يدينون دين الحق من الذين اوتـوا الكتـاب حتـى يعطوا الجزية عن يد و هم صاغرون / التوبة/ ٢٩.

ئەم ئایەتانەش دیارە بۆ هـەموو كـات نـین، بـەڵكو تايبـەتن بـە كاتی جەنگ ( فان انتهوا..)، جەنگەكەش بۆ ناچار كردن نیە كـە ئـەوان بـاوەڕبهێنن، بـۆ ڕێگەگرتنـە لـە دروسـتبوونی فیتنـە كـە چەندین مانای هەیە) لەپێشەوە باسمان كرد باوەڕهێنـان دەبـێ بەدڵ و لە خواست و ڕەزامەندییەوە بێت وڕێسای بنـەڕەتیش لـە وەرگرتنی ئایینـدا ((لااكراه فی الدين ))ە.

پـێش ئایەتەكـەی سـوورەتی(البقـرة)، سـێ ئایـەت بـاس لـە دەستدرێژیی و دوژمنكـاریی بـەرەی بەرانبـەر دەكـەن، بەرانبـەر بـەوەش خـوای گـەورە داوای بـەرگری و هەڵوێـستی هاوشـێوە دەكـات،(ولا تعتـدوا)،( و اخرجـوهم مـن حيـث اخرجـوكم)،(فـان قاتلوكم فاقتلوهم)،(فان انتهوا فان الله غفور رحیم)..پاش هەموو ئەمانـە ئـەوجا دەچێتەسـەر ئایـەتی( و قـاتلوهم حتـى لا تكـون فتنه..) دوای ئەم ئایەتەشە كە دەفەرموێ((فمـن اعتـدى علـيكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم)).

ئایەتەكەی سوورەتی تەوبەش وەها دیارە بۆ هاندان باسـی دیـن و ئیمـانی تێـدا هـاتووە، جەنگەكـەش لەگـەڵ دوژمنكارانـە لـە یەهوود نەك بێباوەڕی لاشەڕ، لە كۆتاییەكەیشدا دیارە تـا ناچـار

كردنيانه بـه (سـەرانەدان) كـه رەمـزى رازيبوونـه بـه دەسـەلاَتى بـەرِيوەبردنى ئيـسلامى و ئەركێكـه لەبەرانبـەر مافـدا، نـەك بـۆ ئيمان هێنان، چونكه كه ئيمانيان هێنا ئيدى سـەرانەيان لەسـەر نيه. كه رازيبوون سـەرانه بـدەن، كەواتـه ئـازادن لـه ئاييندارِيى خۆيانـدا، ئـەم هەلْوێـستەش زێـتر بەرهـەمى گـۆرِانى هەلْوێـستى خۆيانه بەرانبەر به ئيسلام، دەنا ئەگەر ئەوان وەك جاران بن كه قورئان وەسفيان دەكات" دەبـێ پێوەنديەكـه گفتوگۆو پێكـەوە ژيان و تێكەلْيى بێت.

ماناى (دين)يـش لـەم ئايەتانـەدا ـ وەك شـەهيد سـەيدقوتب لـه تەفسيرەكەيدا ئاماژەى پێكردووە ـ ماناى بەرنامـه و دەسـەلاَتى ئيسلامه نەك ئيمان، دەشێ له كـاتى جەنگـدا كەسـێ شـايەتمان بێنێ و تەسليم ببێ و به دەسەلاَتى سياسى ئيسلام رازيـى ببـێ، بـەلاَم ئيمـانى دانەمـەزرێت ـ وەك لـه پێـشەوەش لـەوبارەوە ئاماژەمان به ئايەت كرد ـ .

له كاتى جەنگيشدا كه داواى گـوتنى (لا الـه الا الله)كـراوە، وەك پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ (امرت لن اقاتل الناس حتى يقولـوا لا اله الا الله و ......./) وا دەزانم هەرچۆرێكه لەنواندنى رەحمـەتى ئيسلام و رێگەگرتن له خوێن رشتن، دەنـا پێغەمبـەر زانيـوێتى و ئاشكراشه مەرج نيه ئەو كەسـەى كه له كاتى جەنگدا ئـەوەى بـه زاردا هات، يان نوێژێكى كرد، ئيدى ببێته باوەردار، بـەلاَم بـەوە

خوێنێك كەمتر دەڕێژرێت. كاتێك (ئوسامەی كوڕی زەید) لە غەزایەكدا لەگەڵ گوتنی (لا اله الا الله)شدا یەكێ لە كافرەكانی هەر كوشت، چونكە پێی ولبووە شایەتمانەكەی لە دڵەوە نەبووە، پێغەمبەر( د.خ ) بەمە زۆر نیگەران بووە، زۆر بە سەرزەنشتەوە گوتوویەتی( ئەرێ تۆ دڵی ئەوت شەقكرد؟؟!!) چەند جارێ پرسیویەتی: (گوتیشی لا الە الا الله و هەر كوشتیشت؟؟ گوتیشی... هەر كوشتیشت ؟!!) ئەم هەڵوێستە دەریدەخات ئەگەر ئیسلام لە جەنگدا سەپاندنی ئیمانی مەبەست بوایە، پێغەمبەری خودا(د.خ) تەنیا گوتنی ( لا الە الا الله)یەكی سەرزاری نەدەكردە نیشانەی باوەڕهێنان و بیانوو بۆ نەكوشتن!!

لە بارەی ئەم ئایەتەشەوە (( قاتلوا المشركین كافة كما یقاتلونكم كافة)) دیارە وشەی (كافة) جێگەی ئەوەیە كە گومان بۆ ئەوە بچێت مەبەست هەموو موشریكانە بە شەڕكەر و لاشەڕەوە، بەڵام نەخێر مەبەست لە كۆمەڵێكی دیاریكراوە لە موشریكان كە لە جەنگدان دژی موسڵمانان نەك هەموو موشریكان، ئەمە بێجگە لەوەی فەرمانەكە پێوەستە بە هەڵوێستی ئەوانەوە، چونكە ئەوانیش دەیانەوێ لەگەڵ هەمووتان(كافة) بجەنگێن و لێتان بكوژن بۆیە پێویستە ئێوەش وەك ئەوان بكەن." ١٧"

له راستیدا به تاکه فاکتەر زانینی جەنگ له بەرهەمهێنانی ئیمان و بلاو بوونەوەی ئیسلامدا، بێجگە له نەشارەزایی یان دژایەتی ئایدۆلۆژیانەی ئیسلام ـ به تایبەت له لایەن هێندێ له ڕۆژهەلاتناسانەوە ـ شتێکی دی نیه، ئەگەرچی له نێو ئەوان و زانایانی ڕۆژئاوادا کەسانی وەهاش هەن شایەتی بۆ بلاوبوونەوەی ئاشتیخوازانەی ئیسلام دەدەن، وەك ( گوستاف لۆبۆن له کتێبی حضارة العرب) و ( میشود له کتێبی تاریخ الحروب الصلیبیه) و ( هنری دێ کاستری له الاسلام خواطر و سوانح) دا و ( ئارنولد له کتێبی الدعوه الی الاسلام )دا و هی دی....

پاشان دەبێ بلێین جەنگی سەردەمی دەسەلاتی ئیسلام هەر پێوەندی به بێباوەڕانی دوژمنکارەوە نەبووە، بەلکو ـ وەك دیاردەیەکی نێو ژیانی مرۆڤ ـ له نێوان موسلمانان خۆیشیاندا ڕوویداوە.. (( وان طائفتان من المؤمنین اقتتلوا فاصلحوا بین اخویکم...الحجرات/ ۹ ـــ۱۰ )) جا ئەگەر جەنگ بەرانبەر به بێباوەڕانی دوژمنکار پێوەندی به سەپاندنی باوەڕەوە هەبوبێت، ئەی لەنێو باوەڕداران خۆیاندا بۆ؟! دیاره له مێژووی موسلماناندا شەڕی وەهاش هەبووە پێوەندی به سیاسەت و یەکلایی کردنەوەی دەسەلاتەوە هەبووە، پێوەندی به سەپاندنی ئیمان و عەرەبچێتی و جیاوازی ڕەگەزەوە نەبووە،

وەك هێنـدێ لـە جەنگـەكانی (ریـددە) و كۆتـایی دەسـەڵاتی راشیدین "١٨".

شایانی باسە، لە قورئانی پیرۆزدا ئەو ئایەتانەی باس لە دیاردەی هەڵگەڕانەوە لە ئایین دەكەن" لە ئایین نەك لە دەسەڵات و رووبەڕووبوونەوەی، وەك ئەوەی پاش كۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ) سەرەتای دەسەڵاتی خەلیفە ئەبوبەكری سدیقدا(س) روویدا" فەرمانێك نیە بۆ سەپاندنەوەی ئایین بەسەر هەڵگەڕاوەكاندا، یان سزایەكی دونیایان بۆ دیاری نەكراوە، وەك كوشتن یان سزای دی، (ومن یرتدد منكم عن دینه فیمت و هو كافر فائلك حبطت اعمالهم فی الدنیا و الاخرة..و ائلك اصحاب النار هم فیها خالدون/البقره/٢١٧) .. هەروەها المائده/٥٤/النساء/١٣٧/النحل/١٠٦".

با لەم ئایەتانەش رامێنین كە سێبەریكی چڕوپڕیان بۆ ئازادی لە ئیمانهێناندا كردووە:

- ولو شاء ربك لامن من فی الارض كلهم جمیعا افانت تكره الناس حتی یكونوا مؤمنین/یونس/٩٩

- فانما علیك البلاغ و علینا الحساب/ الرعد/ ٤٢.

- ..قد جائكم من الله نور و كتاب مبین یهدی به الله من اتبع رضوانه سبل السلام ../ المائدة/١٥.

ـ فلعلك باخع نفسك على اثارهم ان لم يؤمنوا بهذا الحديث اسفا/ الكهف/ ٦.

ـ من شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر، انا اعتدنا للظلمين نارا / الكهف/ ٢٩.

ـ انا هديناه السبيل اما شاكرا و اما كفورا / الانسان/٣.

ـ ومنهم من يؤمن به ومنهم من لا يؤمن به و ربك اعلم بالمفسدين /يونس/٤٠ .

ـ هو الذى خلقكم فمنكم كافر و منكم مؤمن والله بما تعملون بصير/التغابن /٢.

**فەتح ..جەنگ یان ئاشتیخوازیی و مژدەی ئازادیی:**

پێشتر روونمان کردەوە بارودۆخی جەنگ بارودۆخێکی ناثاساییە، هەروەها حاڵەتێکە ناچاریی دروستی دەکات، پێوەندیی بە دەستدرێژیی و ستەمکاریی و بەرگریی لە خۆکردنەوە هەیە، حاڵەتی ئاسایی بۆ گەیاندنی ئیسلام بانگەوازە ئەویش بە حیکمەت، لە پێوەندیی نێوان ئایینەکانیشدا چوارچێوەی گشتیی و هەمیشەیی پێکەوەژیان و گفتوگۆیە ـ وەك لە باسی ئیسلام و ئایینەکانی دیکەدا دەچینە سەری ـ .

ئیسلام لە قۆناغی مەککەدا بە خۆڕاگریی و لە رێگەی بانگەوازەوە، بناغەی بۆ دانرا و پایەکانی داڕێژران، لەمەدینەش لە سەرەتای کۆچکردنەوە(بە بێ جەنگ) بنەما و رێوشوێن بۆ پێکەوەژیان و پێوەندیی لەگەڵ ئایین و پێکهاتەکانی دیکە دانرا.

لە ماوەی دوو ساڵی (رێککەوتننامەی حودەیبییەدا)شدا ئیسلامەتی وەها بە خێرایی گەشەی کرد و گەیشتە دەرەوەی نیمچە دوورگەش، ژمارەی موسڵمانان بە گشتی لە (( ١٤٠٠)) کەسەوە گەیشتە (( ١٠٠٠٠ دەهەزار))"١٩" ...، دەشێ هەر ئەمەش هۆیەکی سەرەکیی هەڵوەشاندنەوەی رێکەوتنەکە بووبێت لەلایەن موشریکەکانەوە لە کاتێکدا ماوەی رێکەوتنەکە

بۆ دە ساڵ بوو، هەر لەو سەروبەندەشدا بوو پێغەمبەر(د.خ) نامەی بۆ پاشاو میرانی دەوروبەر دەنارد بۆ وەرگرتنی ئاینی ئیسلام.

پاش گەڕانەوەش بۆ مەککە، هەلومەرجێکی گەورەتر بۆ بلاو بوونەوەی ئیسلام هاتە ئاراوە، ئەوە بوو شاری مەککە بە بێ جەنگی چەکدارانە ئازاد کرا و کۆمەڵ کۆمەڵ ( افواجا) خەڵك دڵی بۆ ئیسلام کردەوە، لە کاتێکدا بە پێی هێندێ پێوەری دەرەوەی ئاین، دەبوو بۆ ئەوێ جەنگ و رووبەروبونەوەی زۆر توند رووی بدایە، چونکە موسڵمانەکان لەو شارەدا سزاو ئەشکەنجەیەکی زۆریان چێشتبوو، ماڵ و سەروەتیان زەوتکرا بوو، دوایی لێیشی دەرکران، کەچی ئەوە بوو پێغەمبەر (د.خ)بە نەیارەکانی ـ بە گشتی ـ فەرموو: (بڕۆن، ئێوە هەموو ئازادن/ بەیهەقیی) دیارە پاشانیش کەس بەزۆر موسڵمان نەکرا، بۆ دەوروبەری مەککەش بە نامە و نێردراوی تایبەت ئیسلامیان پێشچاوخرا ـ وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد ـ خوای گەورەش رێکەوتنی حودەیبیە و ئازادکردنی مەککەی ـ کە ئەویان پێشەکی و رێخۆشکەر بوو بۆ ئەمیان ـ بە سەرکەوتن و (فتح) بەڵکو رێککەوتنەکەی بە(فتحا مبینا) ناو برد ((انا فتحنا لك فتحا مبینا/ الفتح/١)).. (( اذا جاء نصرالله والفتح و رایت الناس یدخلون فی دین الله افواجا/النصر/١))، ئەو ناوبردنەش

دەبێتە هۆی دڵخۆشییەكی لە سنوور بەدەری پێغەمبەر(د.خ) ـ وەك موسلیم بۆمانی دەگێڕێتەوە ـ لە كاتێكدا كەسی وا هەبوو لە موسڵمانان نەیدەزانی كە ئەوەش سەركەوتنە چونكە دیارە (فتح)سەركەوتنی هەر بەجەنگەوە پێوەست كردووە: ((یا رسول الله افتح هو؟ نعم والذی نفس محمد بیده انه لفتح)) چونكە ئەوە ئامانجە بنەڕەتییەكەی ئیسلام ـ فەتحی دڵان ـی لە دوابوو. بەرانبەر بەو سەركەوتنەش قورئان مژدەی پاداشتی شایستەی گەیاند، وەك چۆن بەشداریكردنی غەزاش پاداشتی هەیە (( لیدخل المؤمنین والمؤمنات جنات تجری من تحتها الانهار/الفتح/٥)).

جێی ئاماژە پێكردن و لەسەروەستانە، كە لە مێژووی ئیسلامدا جەنگەكانی سەردەمی خەلافەت بە (فتوحات) ناو براون، بەلام قورئان (ڕێككەوتنی حودەیبییە) و (ئازادكردنی مەككە)ی بە (فتح) و(فتحا مبینا) ناوبردوون، ئیدی هیچ جەنگێك لە جەنگەكانی سەردەمی پێغەمبەری بێجگە لە جەنگی بەدر ((ان تستفتحوا فقد جائكم الفتح/الانفال/١٩))بە(فەتح) یان بە (فتحا مبینا) ناو نەبردوون .

لە سەردەمەكانی دواییدا ـ بەتایبەت لە سەردەمی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ـ بە ئاشتی و لە ڕێگەی بازرگانیی و تێكەڵیی و ناسینەوە، لە سەردەمی ئومەوی عەبباسی و عوسمانیشدا ـ

لەگەڵ ئەو لادانەی دەسەڵاتیشدا لە چەند بنەمایەکی قورئانیی بۆ حوکمڕانیی" لە زۆر وڵاتدا بەبێ جەنگ، لە سەر دەستی زانایان و بانگخوازان ئیسلامەتی هەر لە بڵاوبوونەوەدا بووە.

پاش رووخانی خەلافەتی عوسمانیی رەمزی دەسەڵات و حوکمڕانێتیش، ئیسلام لە هەموو جیهاندا هەر لە بڵاوبوونەوەدا بووە، جا ئەگەر رۆژگارێك ئیسلام دەسەڵات و هێزی سوپای هەبووبێت، پاش داڕووخانی دوا دیواری خەلافەت.لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، ئیمان و ئیسلامەتی لە ناخی دڵ و دەروون و لە نێو جومگە کۆمەڵایەتیەکاندا چۆن بە پارێزراوی مایەوە لە بەرانبەر ئەو هەموو دژایەتیە هەمەجۆرەشدا؟!

لەم رۆژگارە نوێیەشدا، ئیسلام بێجگە لە هێزی مەعنەوی، بێجگە لە هێزی وشە، چ هێزێکی هەیە رەها ئاوێتەی ژیان بووە؟ تەنانەت لە ئورووپا و ئەمریکا و وڵاتانی بە ئایین مەسیحیی و جوولەکەشدا، لەسەرزەمینی لەبلیکبوونی عەلمانیەتدا، موسڵمانبوون بۆتە دیاردەیەکی بەرچاوی بەردەوام، سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵانەی کە بۆ شێواندنی ئیسلام دەدرێت..، سەرەڕای نەزانیی و نەشارەزایی و توندڕەویی و پەرگیریی چەندین کاراکتەر و دەستە و تاقمی موسڵمانیش؟!..سەرەڕای ئەوەی لە ئێستادا لە هێندێ وڵاتدا، چەند لایەنێکی پابەندبوونی ئایینیی - بە نموونە وەك باڵاپۆشیی - دژایەتی دەکرێت و دەشێ

بێبەشکردنیشی لە کۆمەڵێك ماف لەدوا بێت، بەڵام چونکە پێوەندی بە رازیبوونی دڵ و دەروونەوە هەیە، قوربانیشیی بۆ دەدرێت.

ئەم شەپۆلە جیهانیەی ئایینداریی لەم سەردەمەدا نەك بە هیچ جۆرێك بەرهەمی زەبر و سەپاندن نیە، بەڵکو بەرهەمی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنێکی خۆویستانەیە، وەك هۆکاریش بەرهەمی گفتوگۆو کرانەوەو پێشکەوتنی هۆکارەکانی گەیاندنە نەك هێز و سەپاندن.

پاش ئەو هەموو بانگێشەیەش بۆ جودلکردنەوەی دین و دەوڵەت، تەنانەت دین و ژیانی گشتیش، کەچی ئەمڕۆ دەبینین دین بە گشتی( بە بێ پەنابردنە بەر هێزیش) لە ژیانی کۆمەڵایەتی و لە دەوڵەت و دەسەڵاتداریتیشدا ئامادەیی و کاریگەریی خۆی هەیە لە چەندین وڵاتی جیهاندا.

**ئیسلام و یاساسازیی جەنگ:**

ئیسلام وەك چۆن كاریگەریی گەورەی لەسەر گۆڕانكاریی لە هەموو كایەكانی ژیاندا هەبوو، جەنگیشی خستە نێو فۆرمێكی تازەوە و یاساو ڕێنمایی بۆ دانا، جەنگ لە پێش ئیسلامدا یاساو ڕێوشوێنێكی وەهای نەبووە شایانی باس بێت، جەنگەكان زۆر سامناك و خوێناویی بوون، ئامانجیش قڕكردن و بندەستكردن و بە كۆیلەكردن بووە، ئەخلاقیاتی دانوستان و ڕێككەوتن و.. مامەڵەی مرۆییانە لەگەڵ خەڵكی لاشەڕ و دیل و برینداردا پرنسیپێكی نەبووە.

بەڵام جەنگ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە پرۆسەیەكە زەمینە و هەل و مەرج و كات و شوێن و ڕێساو ڕێنمایی تایبەت بە خۆی هەیە، فەقیهی ناودار شەهید ناصری سوبحانیی، بۆچوونی وەهایە كە جیهاد دەبێ بەمشێوەیە دەست پێبكات:

ـ موجاهەدەی نەفس و هەوا: موجاهەدەیەك كە باوەڕدار بگەیەنێتە ئاستی ئەوەی لەبەردەم هیچ جۆرە تەماع وەبەرنان و ترساندنێكدا چۆك دانەدات و ئامانجی ژاتیی ئاوێتەی ئامانجی جیهاد نەكات، لەڕاستیدا ئەگەر ئەمجۆرە موجاهەدەیە نەبوو، نیەت بۆ خودا یەكلایی نەكرابەوە، هەنگاوی دی ئاسان

نین.(شەهید سەید قوتبیش هەمان بۆچوونی هەیە، وەك لە پێشەكی تەفسیری سوورەتی ئەنفالدا ئامازەی پێكردووە).

ـ موجاهەدەی نیزیكان و كەسوكار كە نەتوانن رێگرین لە بەردەم مەحەببەتی خودایی و پابەندبوون و جێبەجێكردنی فەرمانندا(( وان جاهداك لتشرك بي ما ليس لك بە علم فلا تطعهما/لقمان/١٥)) ...((قل ان كان لباتكم و اخوانكم ...)).

ـ موجاهەدەی كۆمەڵگە((یاخیی بوون لە نەریتی نادروست و خۆراگریی لەبەردەم جەنگی دەروونییدا)).

ـ موجاهەدە لەگەڵ سیستمی تاغووتیدا (( قل ان صلاتي و نسكي و محياي و مماتي لله رب العالمين/الانعام/١٦٢))..(( وجاهدوا في الله حق جهاده/الحج٧٨)) (( ان الله اشترى من المؤمنين انفسهم و اموالهم بان لهم الجنة/التوبة/١١١ ))

ـ ئامادەسازیی هێزیی مادیی بە هەموو جۆرەكانیەوە.

پاش هەموو ئەوانە، ئەوجا ئامادەسازیی بە كۆمەڵ( پرس و راوێژ)، بەرچاوروونیی لە ئامانجی جیهادی چەكدارانەدا، ئەوجا زانیاریی و شارەزایی بە رێساو رێوشوێنەكانی جەنگ. وەك دوایی شتێكیان لەبارەوە دەڵێین ـ"٢٠" لەسەروو هەموو ئەوانەشەوە جەنگ لە پێناو پاراستنی ئیمان و پاشان چەسپاندنی دەسەلاَت و سەرپێكەوتن( تمكين)، ئەویش لە پێناو خوداپەرستی و چاكەكاریی و ئاوەدانكارییدا (( الذين ان مكناهم

فی الارض اقاموا الصلاة و امروا بالمعروف و نهوا عن المنكر و لله عاقبة الامور/الحج/٤١)).ئەو كاتیش حوكم بە ئایەت و باپەندكردنی خەڵك بە یاساو ڕێسا و ڕێنماییەوە لە كایەكانی سیاسەت و ئابووریی و كۆمەڵایەتیدا(ئەگەر حیكمەتی لەگەڵ نەبێت) هەر كارێكی ئاسان نیە، پابەندبوونیش بە پەرستشە رۆحیەكانەوە (ئەگەر ئیمان و عیشق نەبێت) ئاسان نیە، سەرەڕای ئەو هەموو ئاسانكاریەش كە شەریعەت كردوویەتی.

بانگەوازو گفتوگۆ ئەركێك و ئەسڵێكە دەبێ هەموو كات ـ كاتی جەنگیش ـ بوونی هەبێت، لە یاساو رێنماییەكانی بواری جەنگ و پرۆسەی سەربازییدا وا هاتووە: كاتی پێش دەسپێكردنی جەنگ، كاتی گەرمەی جەنگ، كاتی پاش جەنگ" گفتۆگۆ هەیە، پێغەمبەرمان (د.خ) لە فەرموودەیەكی درێژدا كە (موسلیم) ریوایەتی كردووە راسپاردەی تایبەتی هەیە بۆ كاتی بەرێكەوتنی سوپا بۆ مەیدان و بەرەكانی جەنگ، كە بووە بە یاسا بۆ چەند لایەنێكی جموجوڵی سەربازییانە: ((چۆن بە رێدەكەون، لەگەڵ كێ دەجەنگن، بۆ دەجەنگن، پێش جەنگ چۆن و لەسەرچی گفتوگۆ دەكەن و لە جەنگدا دەست لە چی و چی دەپارێزن؟))، ( .... واذا لقیت عدوك من المشركین فادعهم ..الخ/موسلیم ) .. پێغەمبەر (د.خ) بە سەركردەی دوو لە سوپاكانی فەرماندەدات:(لا تقاتلوهم حتی تدعوهم للایمان، فان ابوا فلا

تقاتلوهم حتى يقاتلوكم و يقتلوا منكم قتيلا، ثم اروهم هذا القتيل و قولو لهم هل لكم خيرا من ذلك بان تقولوا لا الـه الا الله..فلان يهدى الله على يدك رجلا واحدا خيرا لك مما طلعت عليه الشمس و غربت/ )...گفتوگۆی دوورو درێژی نێوان نوێنەرانی موسڵمانان و سەرکردەی سوپای فارسیش بۆ ماوەی (حەفتاودوو سەعات) لە جەنگی قادسیەدا، نموونەیەکە لە گفتوگۆی پێش جەنگ و وەك رێسایەك پێرەوکراوە. "٢١"

(ئەنەس) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەرمان(د.خ) فەرموویەتی: (انطلقوا بسم الله، و على ملة رسول الله، لا تقتلوا شيخا فانيا ولا طفلا صغيرا ولا امرأة ولا تغلوا واصلحوا و احسنوا ان الله يحب المحسنين ) هەروەها ( ولا تقتلوا اصحاب الصوامع )..، سوپای ئیسلام بەم رێنماییانەوە بۆ جەنگ بەرێکەوتووە، تەنانەت لە رێنماییەکاندا ئاماژە بە زیان نەگەیاندن بە دارو دەوەن و ئاو و ئاژاڵیش کراوە، ئەو دەستەو کۆمەڵەی کە جەنگی لەگەڵ دەکرێت بەر لە جەنگ زۆر بە وردی دیاریکراوە بۆ ئەوەی لەوە زیاتر دەست بۆ هیچی دی نەبرێت. "٢٢"

ئەوەی لەم سەردەمەدا لە بارەی جەنگەوە یاسای نێو دەوڵەتی دەیخوازێ و داوای دەکات، ئیسلام بە چەندین سەدە پێش ئەوە داوای کردووە.

دیاره هەموو ئەمانەش تیشکێکن لە تیشکی ئایەتەکانی (( ولا یجرمنکم شنئان قوم علی الا تعدلوا، اعدلوا هو اقرب للتقوی/ المائده/ ٨...)هەروەها(( وما ارسلناك الا رحمة للعالمین / الانبیاء/١٠٧)) دەبێ لەکاتی دوژمنایەتی و جەنگیشدا ئەو رەحمەت و عەدالەت و ئەخلاقەی ئیسلام سێبەر بن و دوژمنایەتی یان کینەبەرایەتیی نەکرێتە پاساوی نواندنی ناعەدالەتیی و ستەمکاریی.

لە کاتی جەنگدا بێگومان پەناهانیش هەیە، لە پەنادانیشدا گفتوگۆ هەیە:(( و ان احد من المشرکین استجارك فاجره حتی یسمع کلام الله، ثم ابلغه مامنه/ التوبه/٦)) ..، ئەم ئایەتە زۆر بە روونیی ئەو مانایە بەرجەستە دەکات کە لەکاتی جەنگدا قسەی خودا نابیسترێ، بۆیە ئەوە کاتی ئیمانهێنان نیە. لەمەش زێتر، ئەگەر ئەوان ئامادەیی رێکەوتنیان تێدا بوو، دەبێ ئێوەش بۆرێکەوتن ئامادەبن (( وان جنحوا للسلم فاجنح لها و توکل علی الله /الانفال /٦١))، رێککەوتنی (حودەیبیە)ش نموونەی رێککەوتنێکی زۆر گەورەی نێوان موسڵمانەکان و نەیارەکانیانە کە پێغەمبەری رەحمەت - وێرای ناڕازیبوونی هێندێ لە هاوەڵە نیزیکەکانی بە سەپاندنی کۆمەڵێك مەرجی قورس - هەموو گیانی ئامادەیی و وەڵامدانەوەی داوای ئەو رێکەوتنە بوو، لە کاتێکدا موسڵمانەکان لە حاڵەتی

بەهێزیشدابوون نەك لاوازیی (( یاایها الذین امنوا ادخلوا فی السلم کافة ولا تتبعوا خطوات الشیطان انه لکم عدو مبین/البقرة/ ٢٠٨)).

دوای جەنگیش کە خەڵك کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانانەوە، بەزۆر باوەڕیان پێنەهێنراوە و ماڵ و موڵکیان زەوت نەکراوە، بەڵکو تا ئەوێ سنووری جەنگ بووە کە دەنگی پەیامی ئیسلام بە ئەودیوی شوراکانی دەسەڵات، ولە بە خەڵك گەیشتووە، دەنا کوشتنی خەڵك و زۆرلێکردنی ئامانجی جەنگ نەبووە بە تایبەت خەڵکی لاشەڕ، ئیدی ئەگەر دەسەلاتدارەکانیش موسڵمان بووبن، ئەوە زۆرجار قسە لەسەر ئەوە کراوە کە پایەو دەسەڵاتە سیاسیەکەشیان پارێزراو دەبێت، وەك سەرکردە سەربازیەکانی سوپای ئیسلام بە رۆستەمی سەرکردەی سوپای فارسیان گوت لە جەنگی قادسیەدا"٢٣"، هەروەك لە نامەکانی پێغەمبەریشدا(د.خ) بۆ پاشاکان ئەو راستیانە دەردەکەون، کە ئەوان هەم رێگر نەبن لەبەردەم گەیاندنی بانگی ئیسلام بە خەڵکی سنووری ژێر دەسەڵاتیان چونکە ئەوان لێیان بەرپرسیارن، هەم ئەگەر موسڵمان ببن ئیسلام تەماعی لە پایە و دەسەڵات و موڵکی ئەوان نیە.

له پاش جەنگیش، دیلەکان هەرگیز بەزۆر باوەڕیان بەسەردا نەسەپێنراوە، وا دەزانم ئەوە بە پێی بەرژەوەندی گشتی دراوەتە دەست دەسەلآت کە بەرانبەر دیل چی بکرێت، چونکە ناکرێ شتێکی نەگۆڕ لەو رووەوە دیاری بکرێت، بۆیە چەند جۆر مامەڵەی جیاواز لە گەڵ دیلی جەنگدا کراوە، بەڵام بێگومان چوارچێوە گشتیەکە چاکەکارییە(ا ستوصوا بالاسری خیرا/ تەبەرانی).

بە کورتی جەنگ لە ئیسلامدا پرۆسەیەکی هەرەمەکیانەی دوژمنکارانە و هەنگاوێکی سەرپێیانەی توندڕەوانە نەبووە، هەموو مەسەلەکانی تایبەت بە جەنگ رێنمایی تایبەتیان هەیە: (نیەت و مەبەست لە جەنگ، ئەوڵەی جەنگیان لەگەڵ دەکرێ ، گفتوگۆ بەر لە دەسپێکردن، کارکردن بە بنەمای " المعاملة بالمثل/ ....فمن اعتدی علیکم فاعتدوا علیه بمثل ما اعتدی علیکم"... ، هەروەها پەنادان، دیل، نوێنەر، جاسووس، رێکەوتن، پابەندبوون بە پەیمانەوە...).

ئیسلام بۆ جەنگیش بە هەمانشێوەی بانگەواز، هەر گوتاری نیە، بەڵکو ئەخلاق و ئینسانیەت و سەرمەشقبوون لە هەمووکاتدا نەخشێکی زۆر کاریگەریان جێهێشتووە لە ناساندن و بڵاو بوونەوەیدا.

سەرکردەی مەزن و ناوداری کورد سەلاحەدینی ئەیووبیی، لە بەرانبەر دەستدرێژیی و ستەمکاریی خاچپەرستاندا، جەنگاوەریی و ئازایەتی چەند فاکتەری سەرکەوتنی بوو، هێندەش ئەخلاق و ئینسانیەت ـ وەك نەیارانیشی شایەتیان بۆداوە ـ " ٢٤ ".

دولجار نالێین غەزا و جەنگەکانی سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی(س) بە هیچ جۆرێك لادان و ناحەقیان تێدا نەکراوە، بەڵام هەرگیز ئیسلام داوای ستەم و سەپاندنی نەکردووە، ئەگەر ناحەقییەکیش کرابێت، دیارە پێچەوانەی رێنماییەکانی ئیسلام بووە، بە نموونە دوو جار کە پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار دەبێت لە غەزاکاندا ژن کوژراوە، فەرمان دەکات نابێت بکوژرێ، لە ریوایەتی دووەمدا (نەدەبوو ئەمە جەنگی لەگەڵ کرابا ..)"٢٦" عومەری کوڕی خەتتابیش(س)، خالیدی کوڕی وەلید(خ.ل) لە سەرکردایەتی سوپا لادەبات و دەفەرموێت" ان سیف خالد فیه رهقا" لەکاتێکدا خالید بەردەوام لە تۆمارکردنی داستانی سەرکەوتندا بوو!.

بکوژی (حەمزەی مامی پێغەمبەر) بەگومان بوو لەوەی کە ئەگەر موسڵمان ببێت خودا و پێغەمبەر لێیخۆش دەبن و موسڵمانەتێکەی قەبووڵ دەکەن، چونکە دەیزانی بە کوشتنی حەمزە چ برینێکی کردبووە جەرگی پێغەمبەر و یارانیەوە، بەڵام

خودا خودای هەموو مرۆڤەکانە، وەك چۆن پێیخۆشە حەمزە ئەهلی بەهەشت بێت پێیخۆشە (وەحشیی ـ بکوژی حەمزە) و ئەولوی بەندەکانی، بەتاوانبارو ستەمکارەکانیشەوە ـ پاش تەوبەکردن و کردنەوەی لاپەڕەی نوێ لە ژیاندا ـ بچنە بەهەشتەوە، با پێغەمبەرەکەشی بە کوشتنی حەمزەی مامی ئازاری قووڵی پێگەیشتبێت! ! خوداوەند وەك خالیقی مرۆڤ و (الهادی و الرحمن و الرحیم) مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات...، پێغەمبەریش (د.خ)جەنگی خێڵی نەکردووە تا لێی نەبوورێ، یان کینەی تایبەتیی بەرانبەری هەبووبێ، ئەو وەك پێغەمبەر بە (رەحمەت) بۆ مرۆڤایەتی و مەخلوقاتی دیکەش نێردرابوو. ئەگەر وەك مرۆڤیش شتێکی لەدڵدا بووبێت، خوای گەورە وەك خالیق و پەرستراوی هەمووان، لێبوردە و میهرەبانە و کینەبەرایەتی لە زاتی پاکی ئاوەشێتەوە.

**غەزا بۆ غەنیمەت :"٢٥"**

ئــەوەی شــتێکی زۆر کــەم لــە ئــاینی شــارەزا بێــت، دەزانــێ سەرەتای هەر ئەرکێکی ئایینی سادەش - چجای جیهاد و جەنگ - نیەت و ناوی خودایە، باوەڕهێنانیش بە تایبـەت لـە سـەرەتای بانگەوازی ئاینیـەوە خـۆ خستنە بـەردەم مەترسـیەکی گـەورە بووە نەك گەڕان بە دوای غەنیمەت و بازرگانیکردنـدا، ئایـەتی (( ان اجری الا علی الله ))ش دروشمی هەموو پێغەمبەران(س) بووە (( ان الذین امنـوا والـذین هـاجروا وجاهـدوا فـی سـبیل الله اولئـك یرجون رحمت الله/البقرة/ ٢١٨)).

هەر جەوهەری ئیمانهێنان و ئیسلامەتی، پەیمان و رێکەوتنە لە سەرخۆ ئازادکردن ـ بە مانایەکی قووڵی روحیی و دەروونیی - لە زنجـیری هــەولو هەوەســە بێبــەها و فریودەرەکــان - وەك لــە پێشەوەش ئامـاژەمـان پێکـرد - دەتـوانین بڵـێین غەنیمــەت و بازرگانیکردنـــە، بـــەڵام بازرگانیـــەك کـــە قازانجـــە گـــەورە و ســـەرەکییەکەی پـاش ئـازادبوون لـە ژیانـدا، بەهەشـتە، دەبـێ موسـڵمان لـە بـەجێهێنانی ئەرکەکانیـدا هـیچ شـتێکی دی ئـەو پاداشت و مەقامەی لە پێشچاو بزر نەکات (( یا ایها الـذین امنـوا هـل ادلکم علـی تجـارة تنجـیکم مـن عـذاب الـیم ٭ تؤمنـون بـالله

ورسوله و تجاهدون فی سبیل الله باموالکم وانفسکم /الصف ١٠ _١١))

خۆ ئەگەر بشچینە سەر مەزهەبی عاشقان و عاریفان، ئەوە هەر مەحەببەتی خوداوەند - بەبێ ترسی دۆزەخ و تەماى بەهەشتیش ـ بەسە بۆ خۆ یەکلاکردنەوە.

لە راستیدا کەسێك دەتوانێ و دەوێرێ بچێتە مەیدانی جەنگی دوژمنان، بەرلەهەرچی لە مەیدانی جەنگی نەفسدا سەرکەوتوو بووبێت.

ئەگەر جیهادکردن بەشێکی پێویستی بە گیانبەخشین بێ، ماڵبەخشین چیە؟ وەك دەشزانین لە بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا سەرەتا باسی غەنیمەت لە ئارادا نەبوو، ئەو بناغە پتەوەی لە مەککە دانرا و ئەو هەموو رەنجەی بۆیدرا، خاڵی بوو لە باسی غەنیمەت.

یەکەمین ئایەتی باسی غەنیمەت(( واعلموا انما غنتم .../الانفال/٤٥)) ـــ دوای جەنگی بەدر- وەك یەکەمین جەنگی نێوان باوەڕداران و بێباوەڕان - هاتە خوارێ نەك پێش جەنگەکە و بۆ هاندانی موسڵمانان و بەکوشتدانیان لە پێناو تاڵانییدا، پاشان ئایەتەکە باسی دڵبەشکردن دەکات نەك کردنی بە مەبەست.

گەیشتن بە قەناعەتی خۆ بەختکردن ئەگەر لەڕێی عیشق و خۆشەویستیی خودایی و باوەڕدا نەبێت..، لە پێناو ئامادچی زۆر بەرزی گشتیدا نەبێت، ئاسان نیە مرۆڤی ساغ لە پێناو غەنیمەتدا کە بۆ ژیانە، ژیانی بخاتە بەردەم مەترسیی لە نێوبردن یان بریندار بوون و بە دیلگیران!

چەندین ئایەت لەگەڵ باسی ئیمان و نوێژدا، باس لە بەخشینی سەروماڵ پێکەوە دەکەن، ئیسلام خەڵك فێری ئەوە ناکات ئایینداری بکانە کاڵای بازرگانیەکی سووك، بەڵکو لە پێناو بڵاو بوونەوەی ئیسلام و ئاسوودە کردنی مرۆڤایەتی و دروستنەبوونی چینایەتیەك کە ڕق و قین و ململانێی سەخت بەرهەم بهێنێ (( کی لا یکون دوله بین الاغنیاء منکم/الحشر/٧)) چەندین ڕێگەو کەناڵی بۆ بەخشین دیاریکردووە.

ئاشکرایە زۆربەی ئەو ئایەتانەی باسی (جیهاد) دەکەن، بە دوایاندا ((فی سبیل الله )) هاتووە، هەردوو سوورەتی (ئەنفال و تەوبە) کە ئایەتەکانیان زێتر بە دەوری باسی جیهاد و جەنگدان، لە بڕی هاندان بۆ دەستخستنی غەنیمەت، کۆمەڵێ ئایەتی بەخشینیان لەو پێناوەدا لەخۆگرتووە، قورئان لە سوورەتی تەوبەدا حوزن و نیگەرانیی ئەوانەمان پێشچاو دەخات کە لەبەر (نەبوونیی و نەدلریی) لە کاروانێکی جیهاد بەجێدەمێنن

((....اعینهم تفیض من الدمع حزنا الا یجدوا ما ینفقون / التوبه/٩٢) .

راسته جەنگ و جیهاد غەنیمەتیشی تێدایە و دوایش دابەشدەکرێ و حەڵاڵە، وەك چۆن لە پاڵ باسی حەج و نوێژی هەینی و زۆر عیبادەتی دیکەشدا بە هەمان شێوە باسی ژیان هەیە، بەلاّم نابێت نیەتی ئەرك و عیبادەتەکە بێجگە لە رەزامەندیی خودا بۆ شتی دیکە بێت.

پاشان غەنیمەت بەشێکی جۆرێکە لە (مولکی گشتیی)، هەروەها یاسا و رێنمایی دابەشکردنی تایبەتی بۆ دانراوە، مەرجیش نیە هەموو کەس هەمووجار دەستی بە غەنیمەت بگات، غەنیمەت بەشی بێباوکان و نەداران و رێبواران و کەسانی تازە موسڵمان بووی تێدا بووە (الانفال/ ٤١ ) هێندێ لەوانەی پاش ئازادکردنی مەککە موسڵمان بوون - کە کەسانی دەسترۆیشتووشیان تێدا بوو - لەوانە بوون کە بە بێ بەشداریکردنی جەنگ - لەبەر دڵڕاگرتنیان - لە غەنیمەت بەشیاندراوە.

پاشان موسڵمانەکانی سەردەمی حەزرەت لەگەڵ غەنیمەت ئەزموونێکی تاڵیشیان هەبوو، غەنیمەت لە غەزای (ئوحود)دا، هۆی تێکشکانێکی سەربازیی بووە بۆیان، نەك هۆی سەرکەوتن، قورئان ئاگادارمان دەکات لەو غەزایەدا کەسانێکی وا هەبوون

چاویان لە غەنیمەت بووە (( منكم من يريد الدنيا ومنكم من يريد الاخـرة/ ال عمـران/ ١٥٢) ...، لـە راسـتيدا ئيـسلام هـەر زوو شۆنكەوتوانی لەوە ئاگادار كردەوە كە ئەوانـەی ئـاين دەكەنـە كـالآی بازرگانيـەكی كـاتيی، خەسـارەتمەندی رۆژی دوايـی ودونياشن: (( ومن الناس من يعبد الله على حرف فان اصابه خير اطمئن به وان اصابته فتنة انقلب على وجهه خسر الدنيا والاخرة، ذلك هو الخسران المبين / الحج/ ١١)).

دواجاريش دەبێ بڵێين ئەو سەركەوتنە گەورانەی چ بـە جـەنگ و چ بە بێ جەنگ موسڵمانان بـە دەسـتيان هێنـاون بـە سـەر ئـەو دەسـەڵاتانەدا كـەزۆر لــە خۆيــان بــە هێزتــر بــوون (وەك ئيمپراتۆريەتی فارس و رۆم)، بەڵگەيەكی بـەهێزتری ئـەوەن ئـەو تێكۆشانە بە پاڵنـەری ئيمـان و لـە پێنـاو ئامـانجی زۆر گـەورەو بـاڵادا بـووە، دەنـا لـە پێنـاو دەسكەوتی بـچووكدا سـەركەوتنی گەورە بەدەست نايەت!

ئەگـەر غەنيمـەت مەبەسـت و ئامـانجی تێكۆشـان بوليـە، پێغەمبەرو خەليفەكانی راشيدين ـ سـەرەڕای گەيشتنی ئيسلام بە موڵكی فارس و رۆم ـ وەها خاكيانە نەدەژيان و... وەها بێ ماڵ و ميراتێك كە شايانی باس بێت ـ نەدەگەڕانەوە بۆ باوەشـی خاك!

**ئیسلام و ئایینەکانی دی (( هەر ئیسلام ئایینە لای خودا )):**

یەکێك لە و هۆیانەی وا دەکات کە بگوترێ ئیسلام باوەڕی بە ئایینـەکانی دی نیـە و خـۆی بـە تاقـە ئـایین دەزانـێ و دەبـێ بـسەپێنرێت" بـە ناتـەواوی تەفـسیرکردنی چـەند ئایـەتێك و وەرنەگرتنی تـەواوی دەقەکـە و ماناکەیانـە: ئـەم بۆچـوونە وەك لای نەشـارەزایان و نـەیارانی ئیـسلام بـوونی هەیـە" لای ئـەو موسڵمانانەش کە باوەڕیان بە سـەپاندنی ئـایین و ئیمـان هەیـە، ئامادەیی هەیە:

ـ ان الدین عند الله الاسلام ...

ـ ومن یبتغی غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه

لە ڕوانگەی پـەیامی ئیسلامەوە، ئایینـەکان هـەموو تەواوکـەری یەکـدین، ئامـانجی ئیـسلام و هـەموو ئایینـە ئاسمانیـەکان، پەرستنی خودا و لـە دڵ دەرکردنـی بـەناوخوداکان و ...، پاشـان چەسپاندنی دادپەروەرییە (( و لقد بعثنـا فـی کـل امة رسـولا ان اعبـدوا الله و اجتنبـوا الطـاغوت /النحـل/ ٣٦ ))، ((ولقـد ارسـلنا رسلنا بالبینات و انزلنا معم الکتاب والمیزان لیقـوم لنـا بالقسـط/ الحدیـد/ ٢٥)) ئیـسلامیش بـە حـوکمی ئـەوەی دوا ئایینـە، کۆکـەرەوە و تەواوکـەری هەموویانـە، تەنانـەت قورئـان لـە یـەك ئایەتـدا بـاس لـە بـاوەڕو کـردەوەی جـوان و پاداشـتی چـاکەی

موسـڵمانان و خـاوەن ئایینـەکانی دی دەکـات(( ان الـذین امنـوا والذین هادوا والنصارى و الصابئین من امن بالله و الیوم الاخـر و عمـل صـالحا فلـهم اجـرهم عنـد ربهـم ولا خـوف علـیهم ولا هـم یحزنون/ البقرة ٦٢)) پێغەمبەریشمان موحەممەد(د.خ) خۆیی و پێغەمبـەرانی دی بـەو خـانووە دەچـوێنێ کـە تـەولوکاریی وجوانکـاریی تێـدا کـرلوە، بـەڵام تـەنیا یـەك خـشتی مـاوە کـە دابنـرێ، دەفـەرمووێ: ( جـا مـن ئـەو خـشتەم، مـن دواهـەمینی پێغەمبەرانم/بوخاریی و موسلیم).

ئیسلامْ وەك ناویش پێوەنـدی بـە تـەواوی ئایینـە ئاسمانیـەکانی دیکەوە هەیە" حەزرەتی نوح (س) دەیفەرموو" فەرمانم پێدرلوە لە موسڵمانان بم:(( وامرت ان اکون من المسلمین /یونس/٧٢))، ئیبراهیم و ئیسماعیل (س) دەیانفەرموو ((ربنا واجعلنـا مـسلمین لـك / البقـره/ ١٢٨)) ، بێگومـان باسـی موسـڵمانبوون لـە ژیـانی پێغەمبەران یەعقوب وموسا و داود و سـولەیمان و عیـسا وچـەند پێغەمبەرێکی دیکەدا (س)هەیە.

یـەکێ لـە پایـەکانی ئیمـانیش باوەڕهێنانـە بـە پێغەمبـەران و پەیامەکانی پێش ئیسلام(( امن الرسـول بمـا انـزل الیـه مـن ربـه والمؤمنون کل امن بـالله و ملائکتـه و کتبـه و رسـله لا نفـرق بـین احد من رسله..../البقرة/ ٢٨٥))، ئەگەر کەسێکیش وا بزانـێ ئیـسلام تـەنیا ئایینـە، لەبـەر ئەوەیـە رێگـەی ئایینـداری ز خـوا

رازیکردنی هەموو پێغەمبەران لە ئیسلامدا چەسپێنراوەتەوە، ئەوەی لە ئایینەکانی دیکەدا هەبووە بە زیادەوە لە ئیسلامدا پارێزراوە و هێنراوەتەوە، ئەگەرچی لەگەڵ ئەمەشدا هەر نابێ بسەپێنرێ.

ئیسلام پێوەندی تەولوکاریی لەگەڵ ئایینە ئاسمانییەکانی پێش خۆیدا هەیە، قورئان پوختەی باس و بەسەرهاتی پێغەمبەرانی دی و ئایینەکانیانی لە دووتوێی خۆیدا پاراستووە، لە قورئاندا وا باس لە ئایینەکان کراوە وەك بڵێی هەموویان یەك ئاین بن (( یرید الله لیبین لکم ویهدیکم سنن الذین من قبلکم/النساء/ ٢٦) لەکۆمەڵێ ئایەتی سوورەتی (ئەنعام)دا پاش باسی فەزڵ و گەورەیی پێغەمبەرانی دیکە و(س) ناوبردنی هێندێکیان، بە حەزرەتی موحەممەدی خاتەم (س) دەفەرموێ: تۆش شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە((اولئك الذین هدی الله، ،فبهداهم اقتده /الانعام/ ٩٠))

ئەمە بێجگە لەوەی لەرووی عیبادەت و شێوازی کارکردنیشەوە لێکچوونێکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە و هێندێك جۆر لە عیبادەت یان دروشمی عیبادەتی، لە هەموو ئایینە ئاسمانییەکاندا بوونی هەیە وەك: نوێژ و ڕۆژوو، تەنانەت نوێژو ڕۆژووی سووننەتیش، هەر بۆ نموونە: (( احب الصیام الی الله، صیام داود کان یصوم یوما و یفطر یوما، و احب الصلاة الی الله

صلاة داود، كان ينام نصف الليل ويقوم ثلثه و يرقد سدسه/ اخرجه ابوداود/ الحديث ٢٤٤٨)).

لەبارەی ئەم ئایەتانەشەوە

یەکەم:( ان الدین عندالله الاسلام):

مانای ئەم ئایەتە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە موسڵمانان بێجگە لە ئیسلام ئایینی دی لە نێوياندا جێنەکەنەوە یان لە نێوی ببەن، راستە موسڵمانانیش دەبێ باوەڕیان وابێ ئایینی هەرەراست هەر ئیسلامە ئەگینا بۆ دوای کەوتوون؟ بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە ئایینی خۆیان بسەپێنن، هەموو کەس لە دونیادا و (لای خۆی) مافی ئەوەی هەیە ئایینەکەی بەراسترین ئایین بزانێ؛ ئەو ئایەتە ماناکەی روونە(( ئاین لای خودا ـ عند الله ـ تەنیا ئیسلامە)) ئیسلامیش بە مانا قووڵ و فراوانەکەی و بەو رەحمەتەیەوە کە ئێمەی مرۆڤ ناتوانین هەمووی بەرجەستە بکەین، ئەگەر سەیری کۆتایی ئایەتەکەش بکەین ماناکە روونتر دەبێتەوە، کە باسەکە باسی قیامەتە(( ومن يكفر بايات الله فان الله سريع الحساب)) دەتا بۆ دونیا ئازادن، ئەگەر موسڵمان بوون ئەوە لە سەرێی هیدایەتن، ئەگەر نا تۆ ئەی موحەممەد تەنیا گەیاندنت لە ئەستۆیە(( فان اسلموا فقد اهتدوا و ان تولوا فانما عليك البلاغ / ال عمران/ ٢٠/١٨)).

*دووهەم: ( ومن یبتغی غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه..):*

ئەم ئایەتەش ماناکەی ئەوەیە هەرکەس شوێن ئاینێکی دی بکەوێ بێجگە لە ئیسلام (( فلن یقبل منه)) لێی قەبوڵ ناکرێ، نافەرموێ ئێوە لێی قەبووڵ مەکەن، کۆتایی ئایەتەکەش ماناکە روونتر دەکاتەوە (( و هو في الاخرة من الخاسرين /ال عمران/ ٨٥)) دیارە ئەوەش بۆ کەسێ کە ئایینی ئیسلامی پێگەشتبێ و ناسیبێتی، دیسان ئیسلام بە مانا خواییەکەی و ئایینی هەموو پێغەمبەران(س)، چونکە هەموویان هەر ئەو کاتەی کە پەیامیان بۆ هاتووە بەڵێنیان لێوەرگیراوە بە موحەممەد و بە ئایینی ئیسلام رازیی بن (( و اذ اخذ الله ميثاق النبيين..........لتؤمنن به و لتنصرنه ../ال عمران/ ٨١..))..، پێویست بووە حەزرەتی موحەممەدیش(د.خ)ئەوە دەربـبڕێ کە باوەڕی بە پێغەمبەرانی پێشووتر و پەیامەکانیان هێناوە، قورئان هەر لە دوای ئەو ئایەتەوە دەفەرموێ (( قل امنا بالله و ما انزل علينا وما انزل على ابراهيم واسماعيل واسحاق و يعقوب و ......../ ال عمران/ ٨٤ )) پاش ئەم ئایەتانە ـ کە تەوەرەی باسەکەیان ئیمان و پێوەندی ئایینی پێغەمبەرانە ـ ئەوجا دەچێتە سەر ئایەتی (( ومن يبتغ غير الاسلام دينا فلن يقبل منه..)) !

ئایەتێکی دی کە هەر پێوەندی بەوانەی پێشووەوە هەیە (( فذكر انما انت مذكر، لست عليهم بمسيطر، الا من تولى وكفر،

فیعذبه الله عذاب الاکبر، *ان الینا ایابهم، ثم ان علینا حسابهم*/ الغاشیه/٢١ )) لێرەشدا دوای باوەڕنەهێنان دێتەوە سەرباسی ئاخیرەت وحەقی خودا و شوێن و دادگای یەکلایی کردنەوەی جیاوازیەکان کە قیامەتە، وەك لە چەند ئایەتێکی دیکەشدا ـ کە لە پێشەوە نووسیمانن ـ ئەو مانایە بەرجەستە بووە ((وان ربك لیحکم بینهم یوم القیامة فیما کانوا فیه یختلفون /النحل١/٢٢)).

ئیدی ئەوانەی کە دادگەی قیامەت دەهێننە دونیاوە، نیارە دەیانەوێ مومارەسەی کۆمەڵێ مافی خودایی بکەن، لە کاتێکدا خۆی رێگەی داوە ژیان هەموو ئاین و دەنگ و رەنگێکی تێدا بێت.

ئیسلام نەیویستووە ئاین نەك بەسەر هەڵگرانی ئاینەکانی دیکەدا، بەسەر بتپەرستانیشدا بسەپێنێ (( ولو شاء ربك لامن من فی الارض ))..وەك لە پێشەوەش بە ئایەت روونمان کردەوە کە ئەگەر کەسێك خۆی نەیەوێت باوەڕ بهێنێت مەلائیکەشی بە تایبەت بۆ بێتە خوارێ، هەر نایهێنێ

ئەگەر بۆ مێژووش بگەڕێینەوە، دەبینین بە درێژایی دەسەڵاتی ئیسلام خاوەن ئاینەکانی دی ئازاد بوون لە ئایینداریدا و دروشم و پەرستگەکانیشیان پارێزراو بوون، تەنانەت بەشێك لە سوننەتی ململانێ و بەرگری، لە پێناو پاراستنی پەرستگەکانی شۆنکەوتووانی ئاینەکانی دیکەدایە (( اذن للذین یقاتلون بانهم

ظلموا، وان الله على نصرهم لقدير، الذين اخرجوا من ديارهم بغير حق الا ان يقولوا ربنا الله، ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع و بيع وصلوات و مساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا واخراج اهلها اكبر / الحج/ ٣٩ ـ٤٠))، بەرجەستەکردنی چەمکی پێکەوە ژیان لەگەڵ (ئەهلی کیتاب) ـ بە پێی وەسیقەیەکی شێوە دەستووریی لە مەدینەی سەردەمی دەسەڵاتی پێغەمبەردا ـ هەروەها بوون و ژیانیان تا ئێستاش لە نێو موسڵماناندا، بەڵگەی ئەو راستیەیە کە ئەگەر بێجگە لەوە ئیسلام داوای هەڵوێستی دیکەی لە موسڵمانان کردبا بەرانبەر بە خاوەن ئایینەکانی دی، بێگومان مانەوەیان وا ئاسان قەبووڵ نەدەکرا.

لە مامەڵەی کۆمەڵایەتیدا پێغەمبەر(د.خ) خۆی سەردانی نەخۆشی دەکردن، ئامادەی پرسەیان دەبوو، مافی دراوسێیەتی دەپاراستن، رێزی زۆر تایبەتی لە وەفدەکانیان دەگرت ( عاباکەی خۆی بۆ رادەخستن تا لەسەری دابنیشن)، تەنانەت قەرزی پارەی لێوەردەگرتن، کاڵای خۆی بە (رەهن) دەدانێ..، ئەمانەش هەموو وەك ئەرکێکی ئایینەکەی، وەك سەرمەشقییەك بۆ شۆنکەوتووانی و لە پێناو بە کولتووورکردنی ئەو جۆرە ئەخلاق و مامەڵەیەدا.

ئەوەش شتێکی سەیر نیە ئەگەر جاروبارێش وەك پێویست و تاك و تەرا مافیان نەپارێزرابێت، ئەوە لە نێو موسڵمانان خۆیشیاندا هەر روویداوە، بەلام چوارچێوەی گشتی، پێکەوە ژیان و چاکەکاریی و پاراستنی مافە، ماف و ژیانی ئەوان لای موسڵمانان وەك جۆرێك لە ئەمانەتی گەردن(ذمة) سەیرکراوە، دیارە پاراستنی ئەمانەتیش لە پێش پاراستنی شتە زاتیەکانەوەیە، خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب(خ.ر)کە پیرەمێردێکی جوولەکەی بینی سواڵی دەکرد، دانی بەوەدا نا کە ئەوە ستەمی بەرانبەر کراوە، بۆیە فەرمانیدا مووچەی بۆ ببڕدرێتەوە.

هەر لە سەردەمی خەلافەتی خەتتابدا(خ.ر)، پاش گەیشتنی ئیسلام بە ( قودس)، خەڵکە کیتابیەکەی هەموو مافێکی ژیان و ئاییندارییان پارێزرلو بوو، کڵێساکانیان پارێزراو بوون، خواردن و خواردنەوەیەك کە ئیسلام لەسەر موسڵمانانی حەرام کردبوو، لە ئەوان حەرام نەکرابوو، تەنانەت بە پێی مەزهەبی پێشەوا ئەبو حەنیفە(خ.ر) ئەگەر موسڵمانێك (بەراز)ی کەسێکی زیممی بکوژێت، یان شەرابەکەی برژێت، دەبێ نرخەکەی پێبداتەوە.

ئیسلام وەك دواهەمین ئایین، رۆحی ئاینەکانی دیکەی لە خۆیدا پاراستووە، ئاینەکانی دی ـ وەك بنەما و ئامانج ـ نەك لە

نێو نەچوون بەڵکو بوون بە جۆرێك لە بناغە بۆ ئیسلام، بەڵام سروشتی بناغە وەهایە کە دیار نیە.

ئەوەی کە خوای گەورە داوای دەکات لە گۆڕانکاریی لە جۆری بانگەواز یان فۆڕمی حوکمڕانیی و لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ئەوە لەبەرچاوگرتنی گۆڕان و پێشکەوتن و گەشەکردنی ژیانە، لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندیی سەردەم و سەرزەمینەکانە..راستە پاش ئیسلام ئایینێکی دیکە نەهاتووە تا ئەمیش گۆڕانکاریی بەخۆوە ببینێ، بەڵام سروشتی ئیسلامیش وەهایە لە هەناوی خۆیدا بواری بۆ نوێکردنەوە و ئیجتیهاد رەخسانئووە.

ئەوەی کە دەبێ بەردەوام ـ وەك بنەما ـ لە نێوان ئایینەکاندا بوونی هەبێت فەزای ئاشتی و لێکنێگەیشتن و پێکەوە ژیان و گفتوگۆیە:

ـ (( لاینهاکم الله عن الذین لم یقاتلوکم فی الدین ولن یخرجوکم من دیارکم *ان تبروهم و تقسطوا الیهم*..... انما ینهاکم الله عن الذین قاتلوکم فی الدین واخرجوکم من دیارکم وضاهروا علی اخراجکم ان تولوهم ../ الممتحنة/ ٩ـ٨))

ـ (( ولا یجرمنکم شنئان قوم علی الا تعدلوا اعدلوا هو اقرب للتقوی/ المائده/٨)) ـ (( ولا تجادل اهل الکتاب الا بالتی هی احسن /العنکبوت/ ٤٦)).. (( قل یا اهل الکتاب تعالوا الی کلمه

سـواء بيننـا و بينـك ....تـا.. فـان تولـوا فقولـوا اشـهدوا بانـا مسلمون/ال عمران/٦٤))

- (( يا اهل الكتاب قد جائكم رسولنا يبين لكم كثيرا مما كنـتم تخفون من الكتاب و يعفو عن كثير، قد جائكم مـن الله نـور وكتـب مبين يهدى به الله مـن اتبـع رضـوانه سـبل السلام ويخـرجهم مـن الظلمـــات الى النـــور باذنـــه ويهـــديهم الى صـــراط مـــستقيم/ المائدة١٥/١٦))..

لـه كۆمـەڵێ ئايـەتی دیكـەدا وێـڕای سـتایش و باسـی گفتوگـۆ لەگەڵیان، خوای گەورە باس لە هەست و نەستی (ئەهلی كیتاب) بەرلنبەر ئیسلام و ستایشی چاكەكانیان دەكات(( وان مـن اهـل الكتـاب مـن ان تامنـه بقنطـار يـؤده اليـك /ال عمـران/ ٧٥))، (( ليسوا سواء من اهل الكتاب امة قائمة يتلون ايات الله اناء الليـل و اطـراف النهـار و هـم يـسجدون..../ال عمـران/ ١١٣)) چـەند ئايـەتێكی دی وێنـەی تێكـەڵیی زێـتر پێشـچاو دەخـەن وەك حەلاڵیی خواردنیان و ژنهێنان لێیان، دیارە خوای گـەورە - وەك خوای هـەموو مـرۆڤ و هـەموو بەنـدەكان - لـە شـوێنی خۆیشیدا سـەركۆنەیان دەكـات، هەڕەشەشـیان لێـدەكات، وەك چـۆن سەركۆنە و هەڕەشەش بۆ موسڵمانانی لادەر لە چەندین ئایەتـدا نمایانـە..، هـەروەها لـە ڕووی تێكـەڵبوونی موسـڵمانان لەگـەڵ دەرەوەی خۆیـان، دەبـێ ئامـاژەش بـەوە بكـەین كـە لـە ڕیـزی

سوپای ئیسلامدا و لە هێندێ لە غەزاکاندا خەڵکانی بێباوەڕ بە ئیسلام بەشداریی جەنگیان دژ بە دوژمنکاران کردووە، وەك غەزای خەیبەر و بەشداریی هێندێك لە جوولەکە، یان بەشداریی سەفوانی کوڕی ئومەییە لە غەزای(حونەین)"٢٦ ". لەسەردەمی ئومەوی و عەبباسییشدا، کەسانی سەر بە ئایینی جوولەکە و نەسرانیی، خاوەنی پۆستی بەرزی کارکردن بوون.

بێگومان لە نێو ئەهلی کیتابدا، هەیانبووە باوەڕی هێناوە یان هەڵوێستی باش بووە بەرانبەر بە ئیسلام، هەشیان بووە باوەڕی نەهێناوە یان سەرەڕای باوەڕ نەهێنان دژایەتی ئیسلام وموسڵمانانی کردووە..ئەمە لە کاتێکدا کە ئەوان لە مەدینەدا و لە سایەی دەسەڵاتی ئیسلام و پێغەمبەردا ژیاون، ئیدی نامەوێ باس لەو هەموو ستەم و ئەشکەنجەدان و زۆرلێکردن و کوشتن و لە نێوبردنە بکەم کە لە سەدەکانی دواییدا و لە ژێرحوکمڕانیی و دەسەڵاتی ئەهلی کیتابدا رووبەڕووی موسڵمانان و ئایینەکەیان بۆتەوە بەتایبەت لە وڵاتی ئەندەلس، کاتێك پاش هەشت سەدە لە حوکمڕانی موسڵمانان کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی خاچپەرستان..

ئایەت گەلێ زۆرن کەباس لەوە دەکەن پێغەمبەران ئەرکیان تەنیا بیرخستنەوە بووە نەك سەپاندنی ئایین:

((المائده ٩٩/الاعراف ١٨٨/يونس/٤١/الرعد/٤٠/الحج/٩٤/النحل /٨٢/الفرقان ٥٦/ الذاريات ٥٢ تا ٥٥ الشورى /٦)).

کۆمەڵێ ئایەتی دیکەش باس لەوە دەکەن کە خوداوەندیش ـ بەو هەموو هێز و دەسەڵاتەیەوە ـ خۆی ئاین ناسەپێنێ چجای ئێوە ((ان نشا ننزل عليهم من السماء اية، فظلت اعناقهم لها خاضعين/ )).

ئیسلام نەك هەر ئاینی نەسەپاند بەسەر خاوەن ئاینەکانی دیکەدا، بەڵکو ئەوانی لە ستەمی یەکدی و ستەمی دەسەڵاتدارانی دی پاراست، ئاخر ئەهلی کیتاب بە تایبەت شۆنکەوتوانی ئینجیل هەموو یەك بەرەو یەك پێکهاتەو یەك قەوارە نەبوون، رێککەوتووە هەر لە نێو خۆیاندا ستەمی گەورەیان لێکدی کردبێت( گەورەترین هەوڵی جوولەکە لە دژایەتی کردنی مەسیحیەتدا، هەوڵی کوشتنی خودی حەزرەتی مەسیح بوو).

ئیسلام کە ئاینی تەواوی مرۆڤایەتی بێت و خودا خودای هەموان بێت ـ وەك لەسەرەتاوە گوتمان ـ بە دڵنیاییەوە دەبێت پێوەندی نێوان مرۆڤەکان لە نێو بازنەکانی پێوەندی ئینسانیی و ئاینی و ئیسلامی و نەتەوەییدا رێکبخات و رێوشوێنی بۆ دابنێت، دەبێ رەحمەت و عەدالەتی ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی بێت، تەنانەت لە حاڵەتی نائاسایی و کاتی

جەنگیشدا، لە بامەکانی پێشوودا لەمڕووەوە ئایەت و حەدیسی زۆرمان پێشچاو خست."٢٧"

سەپاندنی ئایین و پێشێلکردنی مافی ئازادی ئایینی و هەڵبژاردنی بەرنامەی ژیان، لەگەڵ عەدالەتی ئیسلام بۆ دونیا و عەدالەتی پەروەردگار لە قیامەتدا ناگونجێت.

خوداوەند کە مافی ژیانی بە هەموو مرۆڤێك بەخشی، ئەوە مافی ئازادی ئایینی و ئازادیەکانی دیکەشی پێبەخشیوە، چونکە ئازادی بە شێکی گەورەیە لە ژیان، خۆ ژیان بە تەنیا خواردن و خەوتن نیە، ئاخر گیاندارەکانی دیکەش دەخۆن و دەخەون، جیاوازی گەورەی مرۆڤ لەگەڵ گیانلەبەرانی دیکەدا بوونی عەقڵ و ئیرادەیە، کە عەقڵ و ئیرادە ئازاد نەبوون، ئیدی ژیانی مرۆڤ لەگەڵ ژیانی گیانلەبەرانی دیکەدا لە جەوهەردا جیاوازیەکی وەهای نامێنێ..

هەروەك ئیسلام لە نێو خۆیشیدا باوەڕی بە جیاوازی هەیە لە ئیجتیهاد و تێگەیشتن لە دەقدا، لە بیرکردنەوە و تەفسیر و تێگەیشتندا بۆ ئایین و ئیمان، لە چوارچێوە فرەوانەکەی ئیسلامدا چەندین مەزهەب و تەرزی عەقیدەتی و ئایینداریی جێگەیان بۆتەوە تا نیزیکبوونەوەش لە سنوورەکانی کوفر.

**لە کۆتاییدا...**

با لەم حەدیسە قودسیە لێوانلێوە لە میهرەبانیی، کەمێ ورد ببینەوە ـ کە (موسلیم) ریوایەتی کردووەو تەنیا پوختەکەی دەنووسین: ( هەموو رۆژێ ئاسمان دەڵێ: پەروەردگارا! رێگەم بدە پارچەیەك لە خۆم بەسەر بەنیادەما بخەم چونکە لە خێری تۆی خواردو شوکری نەکردی..

دەریا دەڵی: با لە خۆما نوقمی بکەم،چونکە...

شاخ دەڵی: با بەسەریا هەرەس بێنم، چونکە...

بەلام خوای گەورە دەفەرمووێ: لێیانگەرێن، لێیانگەرێن، ئەگەر ئێوە دروستتان کردبان رەحمیشتان پێدەکردن.. ئەوانە بەندەی منن، ئەگەر تەوبەیان کرد ئەوا من خۆشەویستیانم"حبیبهم"، ئەگەر نەشیانکرد، ئەوا خۆم چارەسازیانم"طبیبهم").

راستە خوداوەند هێندێ لە ناوەکانی پێوەندیان بە توورەبوون و بەسزا گەیاندنەوە هەیە، وەك دەڵێن ( شدید العقاب)یشە، بەلام خۆی لە حەدیسیکی قودسیشدا فەرموویەتی (ان رحمتی سبقت غضبی) کە لە کۆمەڵێ ئایەت و ئاماژەش ورد دەبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە موسڵمانان دەبێ زێتر سەروکاریان لەگەڵ ئەو ناوانەی خودای گەورەدا هەبێت کە پێوەندییان بە نواندنی سۆز و بەزەیی و لێبوردەییەوە هەیە نەك ئەو ناوانەی کە

پێوەندییان بە توورەیی و تۆڵەسەندنەوە هەیە، خوداوەند لە نێو هەر (٩٩) ناوەکەیدا هەردوو ناوی ( الرحمن الرحيم ) دەخاتە پاڵ ناوی (الله) لە سەرەتای سوورەتەکانی قورئان و سەرەتای هەموو کارێکی موسڵمانانیدا ؟! گوتنەوەی ئەو دوو سیفەتە لەپاڵ ناوی خوادا (بسم الله الرحمن الرحيم) لە سەرەتای هەموو کارێکدا دەلالەتی ئەوەیە کە موسڵمان دەبێت تیشکی رەحمانیەت و رەحیمیەتی خودای تێدا جیلوە بکات و زیتر سەروکاری لەگەڵ ئەو دوو ناوەیدا هەبێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەورووبەردا، رۆژانە( ١٧) جار گوتنەوەی (بسم الله الرحمن الرحيم) لە نوێژە فەرزەکاندا ـ وەك (فەخری رازی) لە تەفسیری (بسم الله)دا فەرموویەتی ـ دەلیلە لە سەر ئەوەی کە خودا تۆی بۆ رەحمەت و ئیحسان خواقاندووە"٢٨". ناوبردنی خوداوەند بەو دوو ناوەوە بۆ ئێمە، دەبێ ببێتە مایەی بەزەیی نواندن سەرەتا بەرانبەر بە خۆمان، پاشان بە دەورووبەر، بە دەسگرتنەوە و زمانگرتنەوە لە ئازاردان تا نیزیکبوونەوە لەو مەقامەی کە بکۆشین لە چاوی رەحمانیەت و رەحیمیەتی پەروەردگارەوە لە هەموو بەندە و مەخلوقەکانی بروانین، نەك لە چاوی خۆمانەوە، کە بێگومان روانینی رەببانیانە بۆ بەندەکان جیاوازە و... رق و رەقیی روانینی مرۆییانە کەم

دەکاتـــەوە، هـــەر لـــەو سۆنگەیەشـــەوەیە کـــە خوداوەنـــد پێغەمبەری(د.خ) سەرمەشقی بە رەحمەت بۆ تەواوی مەخلوقات ناردووە(( وما ارسلناك الا رحمة للعالمين/الانبياء/١٠٧)).

***پەراوێز و سەرچاوە:***

١ـ هەر یەك لە:مەریوان وریا قانیع لە (دەربارەی فەلسەفەو ئیسلام و رۆشنگەری / وەلامێك بۆ كتێبەكەی كاك مەلا بەختیار)، ئەبوبەكر عەلی لە (ناسیونالیزم و ناسیونالیزمی كوردی ـ سیدێكی ئیسلامی ماوچەرخ) ، هیوا عەزیز سەعید لە (ناسیونالیزمی كوردی )و چەند سەرچاوەیەكی دیكەی كوردی، بە روونیی باسیان لە هەلومەرج و سەردەمی سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لە رۆژئاواو رۆژهەلات كردووە. كە بەرهەمی سەردەمی نوێیە و لە رۆژگاری سەرهەڵدانی ئیسلامدا شتێك بە ناوی ناسیونالیزمەوە بوونی نەبووە.

٢ـ بۆ ئەم جۆرە ئازادیانە بڕوانە: د.مصطفى ابراهيم الزلمی/حق الحرية في القران الكريم/ط٢/اربيل/٢٠١١..

٣ـ بڕوانە: نەبەز هەورامی/ پێغەمبەرێتی محمد( د.خ) .../ ٢٠١١

٤ـ بڕوانە: علي سامي النشار/ نشاة الدين/٢٠٠٩".

٥ـ هەمان سەرچاوە.

٦ـ بڕوانە : فراس السواح/دين الانسان/بحث في ماهية الدين و منشا الدافع الديني/ط/٤/٢٠٠٢.

٧ـ بۆ مانای هیدایەت و هەموو جۆرەكانی هیدایەت، بڕوانە: نشوة العلواني/ الهداية في القران الكريم/ط/١/٢٠٠١.

٨ـ ناسری سوبحانیی/بانگەوازو قۆناغەكانی بانگەوازكردن/ئامادەكردنی ئارام موحەممەد و سەروەت عەبدوڵڵا/چ/١/٢٠١١.

٩ـ هەمان سەرچاوە/ل/٢٢٠.

١٠ـ هەمان سەرچاوە/ل/١٦٢.

١١. هەمان سەرچاوە/ل/١٧٥ ـ ١٩٠.

١٢ـ بــۆ نموونـــە بڕوانـــە: د. محمـــد علـــى الـــصلابي/الـــسيرة النبوية/ط/٤/بيروت/٢٠٠٤.

١٣. سەعیدی نورسی /موعجیزاتی ئەحمەدی ل ١٠٧ / و. مامۆستا فاروق رەسول یەحیا ـ ئەم ئایەتەش((لن نشا ننزل عليهم من السماء اية، فظلت اعناقهم لها خاضعين))پشتگیری ئەو بۆچوونە دەکات.

١٤ ـ ئەبەز هەورامی/ لە بارەی گوتارو رەفتـارەوە/ ئـەخلاق مـوعجیزەی پێغەمبەرلن بۆ مرۆڤایەتی/رۆژنامەی یەکگرتوو/٨٧٥/٣٠/١/٢٠١٢

١٥ـ عمـرو خالـد/ قـراءة جديـدة و رؤيـة.. فـى قـصص الانبيـاء../ ط/٤/٢٠٠٧ص٣٧٩ .

١٦ـاحمد شلبي/الجهادوالنظم العسكرية فى التفكير الا سلامى/ص٤٧ ـ٥٠.

١٧ـ د.عبدالخالق النواوى /العلاقات الدولية والـنظم القـضائية فـى الـشريعة الاسلامية/ط/١/١٩٧٤/ص/١٠٧.

١٨ـ د. محمد عمارة ـ الاسلام والحروب الدينية/ ١٩٩٦( لە بارەی پێوەندی سـوپا و دەوڵـەت و دەسەڵاتیـشەوە، هـەر سـوود لـەم سەرچـاوەیە وەرگیراوە).

١٩. سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە/١٢.

٢٠ـ ناسری سوبحانیی/ بانگەواز ـ قیناڵ/ل ١٩٢ ـ ٢١٩.

٢١ـ سيد قطب/ فى ظلال القران/ پێشەکی تەفسیری سوورەتی ئەنفال .

٢٢ـ بڕوانە د.عبدالخالق النـواوى/العلاقـات الدوليـة والـنظم القـضائية فـى الـشريعة الاسـلامية/ط/١/١٩٧٤/ص/٨٨..هەروەها بڕوانـە: احمـد شـلبى /الجهاد والنظم العسكرية فى التفكير الا سلامى/ص/٩٥.

٢٣- د.احمد شلبی/الجهاد والنظم العسکریة فی التفکیرالا سلامی/ص٩٤.

٢٤- د. علی محمد الصلابی/ صلاح الدین الایوبی/ط/١/٢٠٠٨.

٢٥- مەریوان وریا قانیع لە کتێبی(دەربارەی فەلسەفەو ئیسلام و رۆشنگەری، وەلامێك بۆ کتێبەکەی کاك مەلا بەختیار) پاش ئەوەی بە کۆمەڵێ بۆچوون و بەڵگەی بەهێز وزانستی وەلامی ئەوە دەداتەوە کە ئیسلام پرۆژەیەك نەبووە بۆ ناسیونالیزمی عەرەبی بەڵکو لەو سەردەمەدا ناسیونالیزم هەر نەبووە، ئاماژە بە بۆچوونیکی (محمد عابد جابری)ی دەکات کە پێیوایە جوڵە و بڵاو بوونەوەی ئیسلام بە سێ هێز یان فاکتەرەوە پێوەست بووە:(قەبیلە، عەقیدە، غەنیمە) /ل/٧٩

٢٦- د.عبدالخالق النولوی/ العلاقات الدولیة و النظم القضائیة فی الشریعة الاسلامیة/ص٨٥/٨٧.

٢٧- بۆ زانیاری لەبارەی پێوەندی نێوان ئیسلام و ئایینەکانی دی، بروانە: عفیف عبدالفتاح طبارة/ روح الدین الاسلامی/ط/١٧/١٩٧٨ ( بۆ چەند لایەنێکی مێژوویی ئەو پێوەندیەش، سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە).

٢٨ - سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە ٢٢/ص/٣٢.

تێبینی: حەدیسەکانی( صحیح الجامع الصغیر) لە کتێبی( فەرموودە قودسیەکان( لە ص ج ص) وەرگێڕاون/ و. هاوڕێ موحەمەد ئەمین/پرۆژەی ١٠٠کتێبی کوردی /٢٠٠٨).

**ئال عیمران و مەریەمی پاکیزە:**

(ال عمران) ناوی دووەمین سوورەتی قورئانە، (عیمران)گەورە پیاوێکی ناودار و کەڵەزانایەکی (بەنی ئیسرائیل) بووە،(ال عمران ) لە پاڵ (ئال ئیبرلهیم) ــ باوانی موحەممەدی پێغەمبەرمان (د.خ) ـ لە یەک ئایەتدا ناوی هێنراوە و ستایش کراوە ((ان الله اصطفی ادم و نوحا وال ابراهیم و ال عمران علی العالمین/ال عمران/٣٣)) هاوسەری عیمرانیش کە بەدوای ئەو ئایەتەدا ناوی هاتووە ((إذ قالت إمرأة عمران)) بەنموونە و وێنەی دیاری ئافرەتی خوداپەرست نیشاندراوە، ئافرەتێك كە نوقمی دەریای مەحەببەتی پەروەردگاری بووە و ڕۆحی هەمیشە باڵندەیەکی سپی بووە لە قووڵایی ئاسماندا

دیمەنێك لەمەحەببەتی ئەو لەم دوعایەیدا دەردەکەوێت (( ربی انی نذرت لك ما فی بطنی محررا/ال عمران/٣٥)) ...، ئەم ئافرەتە ئاگری مەیلی منداڵبوون لە ناخیدا هەڵدەگیرسێ، منداڵیشی بۆیە دەوێت تا بۆ خزمەتکردنی پەرستگەیەك نەزری بکات، نەزرکردن نەریتێکی جوانە لە پەرستش، وەك چۆن پێشتر نەزر دەکرێت، ئەم(جەرگ)ی خۆی نەزر دەکات! !پاش ئەوەش ـ وەك نەریتی جوانی پێغەمبەران وپیاوچاکان وخواویستان ـ نزا بۆ قەبوڵ بوونی نەزرەکەی دەکات ((فتقبل منی )) .. خوای

گەورەش بەو پەڕی ڕەزامەندییەوە لێی قەبووڵ دەکات((فتقبلها بقبـول حـسن))..، زۆر بەباشـیش لـە ژێـر چـاودێری خۆیـدا پێیدەگەیـەنێت ((وانبتهـا نباتـا حـسنا))..، تۆبـاڵی پـەروەردە کردنیـشی دەخاتـە ئەسـتۆی پێغەمبـەرێکی سـەردەمەکەی خۆی((وکفلها زکریـا)) ئـەویش هـەر بەکۆرپـەیی لـە ژێـر نـووری میحراب و لـە سـێبەری پەرسـتگەدا پـەروەردەی دەکات، ئیـدی لەناو کەرامەتداریدا پەنجەرەی ژیانێکی ئاسمـانی بۆ دەخرێتـە سەر پشت ((کلما دخل علیها زکریا المحراب وجد عنـدها رزقـا/ال عمران/ ٣٧))

تا ئێرە لەگەڵ باسی (هاوسەری عیمران) ـ دایکی مەریـەم ــ دا بـووین، بـا لێـرەوە ئـەو بـەجێبهێڵین و دوای تروسـکەی ژیـانی کۆرپە نەزر کراوەکەی بکەوین، ئەو کە لە ساتی لەدایکبوونیـشدا ــ لـەو سـاتەدا کـە شـەیتان دەسـت لـە هـەموو بـەنیادەمێك دەوەشـێنێت ـ خـوای گـەورە چـاوی ڕەحمـەتی لێیـەتی و لـە دەستوەشــاندنی شــەیتان دەیپارێزێــت، وەك پێغەمبــەری ئیسلام(س) لە فەرموودەیەکیدا ئاگاداری کردووین: (مامن مولود الا والشیطان یمسه حین یولد فیستهل صارخا من مـس الـشیطان الا مـریم وابنهـا)"٢" چـونکە لەگـەڵ نەزرکردنیـدا لـە دوعایـەکی سەنگین پێچرابوو ((واني اعیذها بك ....)) نەك هەر خۆی بـەڵکو نەوەکەشی ((...وذریتها من الشیطان الرجیم )).

پـــاش ئەمـــەش خـــوای گـــەورە لەســـەر زمـــانی فریـــشتە پێیڕادەگەیەنێت کە تـۆ ئـەی مـــــەریەم دووجـار هەڵبـژاردەی خـــودای ((ان الله اصـــطفاك و طهـرك و اصـــطفاك علـــی نـــساء العالمین/ال عمران/ ٤)) وەك چۆن باوانیشی هەڵبژاردە بوون.

پاشـــــان بـــــە (صـــــدیقة)ش نـــــاوی دەبـــــات ((و امـــــە صدیقة/المائدة/٧٥)..، وێڕای ئەمانەش ناوەکەشی دەبێتە نـاوی سوورەتێکی قورئانی پیرۆز.

لێرەدا زۆر جێگەی خۆیەتی ئەوە بە بیربهێنینەوە کە ئەگەر لە نێـو ئافرەتانـدا پێغەمبـەران (س) هەڵنەکـەوتون، لـە نێویانـدا ئـافرەتی وەك مەریـەم هەڵکـەوتووە، کـە - وەك پێغەمبـەران - هەڵبژاردەیە و هەر لە باوانەوە بەپاکیی هاتووە و بەکۆرپەیی لـە غەیبـەوە ڕۆزی ژیانی بۆ نێردراوە و چاودێریی کراوە، کـە لـە دایکیش دەبێت خـودا لـە دەسـتی شـەیتانی دەیـپارێزێ و چـەند جارێکیش فریشتە (جبریـل) لـە نێوانیاندایـە، وەك کـاتی خـەلق کردنی مەسیح، بێجگە لەمانـەش لـە باسـی گـەورەیی و فـەزڵی بنەماڵـەی مەسـیحدا - وەك پێغەمبـەرێك - باسـی مریـەم و پێـــشتریش دایکـــی لـــە ئارادایـــە(( وجعلناهـــا و ابنهـــا ایـــة للعـالمین/الانبیـاء/ ٩١)) ئیـدی بێجگـە لـەوەی مەریـەم (س)بـە سـوعجیزە منـاڵی دەبێـت، بێجگـە لـەوەی کـە وەك پێغەمبـەران (سڵاوی خوایان لێبێت) دووچاری میحنەتی گەورە دەبێـت، وەك

ئەوان ڕێگەی هیجرەت دەگرنە بەر، وەك ئەوان خودا ستایشی دەكات و خۆی دەیدوێنێ و ڕێگەی پەرستشی نیشان دەدات ((یا مریم اقنتي لربك و اسجدي و اركعي مع الراكعين /آل عمران/٤٣)).

دواتریش لەگەڵ باسی مەسیحی كوڕیشیدا (سڵاوی خوایان لێبێت) نیشانەی دیكەی گەورەیی ئەم ئافرەتە دەبینین...

**مەسـیح و موعجیزەی لەدایکبوونی:**

مەسـیح (س) لـە قـوڵایی ئـەو پـاکیی و پیرۆزییـەوە چـاو بـۆ ئاسۆکانی ژیان هەڵدەهێنێ، ئەو رۆڵەی ئافرەتێکە بـە کۆرپـەیی نەزری خودا کراوە, ئافرەتێك کە دایکی هاوسەری پیاوێکی وەك (عیمران) بووە, ئافرەتێك کە هەڵبژاردەی خودا بووە, وەك چۆن پێغەمبەران هەڵبژاردەی خودا بوون.

مەسیح وەك هەر منـاڵێکی دیکـەی سـەر زەوی لـە دایـك نابێـت, دایکیشی بەرهەمی دوعایەکی عاشقانەیە.

فریـشتەکانی دەوری عەرشـی پـەروەردگار بـە شـەقەی بـاڵی درەوشـاوەیانەوە, دەگەنـەلای مەریـــــــــەم: ((ان الله یبـشرك بکلمـة منـه المـسیح ابـن مـریم وجیهـا فـی الـدنیا والاخـرة ومـن المقربین/ ال عمران/٤٥)).

هێشتا رۆشنایی سەرزەوی بەر نەکەوتووە, لە ئاسمانەوە و لـە سەر زمانی فریشتەوە ناوی لێدەنرێت و بەرزیی پلە و پایـەی لـە دونیا و قیامەتدا دیاری دەکرێت. پاشان مەسیح لە سـەر وێنـەی بـاوکی مرۆڤایـەتی، لەسـەر وێنـەی یەکـەمین مـرۆڤ (حـەزرەتی ئادەم/س)، مرۆڤێك کە لـە بەهەشتـــــــــــــــــــەوە بەرە و سەر زەوی هاتووە، خەلق دەکرێت ((ان مثل عیسی عند

الله كمثل ادم خلقه من تـراب ثـم قـال لـه كـن فيكـون/آل عمـران/ ٥٩)).

خـــوای گـــەورە لـــە ئاوێنـــەی خـــەلقكردنی زۆرێـــك لـــە بەخلوقاتەكانیدا دانـایی و دەسـەلاتی خۆی نوانـدووە, وەك لـە دروست كردنی مرۆڤدا بەگشتی, بەلام لـە دروسـتكردنی هێنـدێك مرۆڤدا، بەتایبەتتر دەسەلاتی خۆی دەرخستووە، بۆ نموونـە لـە دروستكردنی ئادەم و مەسیحدا (سلاوی خوایان لێبێت)

بەنی ئیسرائیل لە خـەلقكردنی مەسـیحدا, لـە بـری ئـەوەی زێـتر توانست ودانانی كردگاریان ببینیایە, كەچی كەوتنە پلارگرتن..

ئەی بەنیسرایل خۆ ئێوە باوەڕتان بـە چۆنێتی دروسـتكرانی( ئادەم ) هەیە كە بەبێ دایك و باب لە گڵ خوڵقێنـدرا،(حـەوا) ش بەبێ دایك, بـەبێ (مـێ ) لـە (ئـادەم / نێـر ) دەرهێنـرا ((وجعـل منها زوجها/الأعـراف/ ١٨٩)) ـ كـە دەشـێ مانـا پێـچەوانەكەشی راست بێت ـ ئـەوەی ئـەولنیش (مـرۆی ئاسـایی) لـە (نێـر و مـێ) دەكەونەوە، ئیدی پێتان سەیر نەبێت خەلقكردنی (مەسیح)یـش جۆرێك بێت لەو هەموو جـۆرە خەلقكردنانـە و بـە تـەنیا هـەر لـە (دایك/ مێ ) یە بـێ (بـاوك/ نێـر ) خـەلق بكرێـت(( ولنجعلـه ايـة للنـاس/مـريم/ ٢١)) .. لێـرەدا جێـی خۆیـەتی بـچینەوە بـەردەم رۆشنایی ئایەتی((هل اتى على الانـسان حـين مـن الـدهر لم يكـن شيئا مذكورا/الإنسان/ ١))

حەزرەتی عیسا بە نەفخێکی خودایی بۆ (مەریەم) لە ڕێگەی جیبریلەوە خەلق دەبێت(( فنفخنا فيه من روحنا/التحريم/١٢)) ئادەمیش بە نەفخێك لە ڕۆحی خودا گیانی بە بەردا دەکرێت(( ونفخت فيه من روحي/الحجر/٢٩)).

خوای گەورە لە ڕێگەی خەلقکردنی مەسیحەوە، خەلقکردنی ئادەم - یەکەمین مرۆڤ - بیری بەندەکانی دەخاتەوە کە زەمەنێکی زۆر بەسەر خەلقکردنیدا تێپەڕیوە.

**سەرنجێکی لەدایکبوونی مەسیح و.. چەند دیمەنێک:**

مەسیـــــــــح کە لە بەرزایی ئاسمانەوە مژدەی خەلقکردنی بەسەرزەوی دەگات, لەسەر زەمینێکیش لەدایکدەبێت کە بە (پاك و پیرۆز) ناوبراوە، مەسیح لە دەورو بەری (بیت لحم) نێزیك بە (بیت المقدس) لە جێیەکی جوان و دڵڕفێندا لە دایك دەبێت (( و جعلنا ابن مریم و امه ایة و اویناهما الی ربوة ذات قرار و معین/المؤمنون/ ٥٠)) لە ئایەتەکانی (١٦ ــ٢٦ ) ی سورەتی (مەریەم )دا چەند دیمەنێکی پڕ پەند و سەرنجڕاکێشی لە دایکبوونی مەسیح نەخشێنراون کە لە کاتی لەدایـــــکبوونی کەســی دیکـــەدا نـــەبینراون " کـــاتی هاتنـــە دونیـــای مەسیـــــــــــح نێزیك بۆتەوە، مەریەم خۆی لە خەڵك دوور دەخاتەوە و بە تەنیا دەچێتە پەنایەك لە نێزیك (بیت المقدس)!.. فریشتەیەك ( جبریل) لە پەیکەری مرۆڤدا لێی دێتە پێشێ، ئەو نازانێ کێیە و ترسی لێدەنیشێ، فریشتەی خودا خۆی پێدەناسێنێ, بۆی ڕوون دەکاتەوە بۆ چ کارێك هاتووە: تۆ بەبێ پیاو منالت دەبێت! !.. ئەوەش بۆ کاری زاتی خودلوەند شتێکی سەیر نیە, مەگەر ئەمری خەلق هەمووی هەر بەدەست خۆی نییە؟..ئەی مەریەم تۆ خۆت نەزرکراوی خوداوەند نەبووی..؟

له ناو ژانی خۆی دهگهیهنێته بنی دارخورمایهك، له ترسی ئهوهی گومانی خراپی پێ ببرێت ئهمهنناى مردن دهكات، بانگی لێدهكرێت لهو خهیالانه وهره دهرێ، سهیری بهردهمت بكه، له ئاوی كانیاوێ بخۆرهوه كه خودا بۆ تۆی ( جاریی ) كردووه، پاشان دارخورماكه داتهكێنه با خورمای تهڕ و تازهت بۆ بكهونه خوارێ, ئهگهر كهسێكیش تۆی دیت وقسهی كرد، بڵێ من نهزرم كردووه بهڕۆژوویم، ڕۆژووی (بێدهنگ بوون)، باشترین وهلام بۆ كهسانی وهها ههر مهگهر بێدهنگ بوون بێت، چهند جوان ناو لهم بێدهنگبوونه نراوه( ڕۆژوو)، ئاخر ڕۆژوو بهگشتی ( بێدهنگ) كردنی جهسته و به دهنگهێنانی رۆحه ـ له بابهتی تایبهتی ڕۆژوودا شتێكمان لهو بارهوه گوتوه.

ئهی مهریهم تۆ بێدهنگ به, لهم كات وشوێنهدا دونیا دونیای ڕۆحه, ئێستا عیسای ڕۆحی خودا، یان خودا خۆی له رێگهی ئهوهوه لێیان بهدهنگدێت و له بری تۆ وهلامیان دهداتهوه، ههر ئێستا كه چهند ساتێكه له نهفخی ڕۆحی خودا خولقاوه.

مهریهمی پاكیزه بهرلنبهر قسه و توانجی نهفامهكان هیچ نالێت، به ئامازه تێیاندهگهیهنێ كه كۆرپهكهی وهلامیان دهداتهوه، با ئهو خۆی پێتان بڵێ كه كێیه و له كوێوه هاتووه و چـــــــی پێیه؟!(( قال انی عبدالله اتانی الكتاب و جعلنی نبیا...وجعلنی مباركا اینما كنت ولوصانی بالصلاة و الزكاة ما دمت

حیا/مریم/۲۰ـ۲۱)) کاتێك کەسێکی بێ خەتا گومانی خراپی پێدەبرێت و تاوانی وەپاڵ دەدرێت, لە بەرانبەردا ئەگەر کەسی دی لە سەری بەدەنگبێت، بەرگری لێکردنەکەی بەهێزترە لەوەی کە خۆی بەدەنگبێت،چجای ئەوەی ئەگەر بەرگریکارەکە خوداوەند بێت..، لە رووداوی (ئیفك) یشدا کە تاوان دەدرێتە پاڵ خاتوو( عائشە)ی خێزانی پێغەمبەرمان محەمەد (د.خ ) خۆی هیچ قسە ناکات، تەنانەت پێغەمبەریش (د.خ) بێدەنگ دەبێت، وەك بڵێی ئەمانیش (ڕۆژووی بێدەنگ بوون ) یان گرتبێت، پەروەدگار خۆی لە سەری بەدەنگ دێت و شایەتی لەسەر پاکیزەیی ئەو دەدات.

**مەسیح و موعجیزاتی:**

دەتوانین بڵێین موعجیزە بەشێکی زۆری لە بوون و ژیانی ئەو داپۆشیبوو، ژیانی بە موعجیزە دەست پێدەکات و بە موعجیزەش کۆتایی پێدێت، بە موعجیزە لەدایك دەبێت، بە مەلۆتکەییش دێتە زمان و خۆی و پەیامەکەی دەناسێنێ و...، پاشان.باس لە موعجیزەکانی دیکەی دەکات ((انی اخلق لکم من الطین کهیئة الطیر فانفخ فیه فیکون طیرا باذن الله و ابرىء الاکمه والابرص و احی الموتی باذن الله، و انبئکم بما تاکلون و ما تدخرون/ ال عمران/ ٤٩)).

موعجیزەکانی مەسیح پێغەمبەریش (درودی خوای لێبێت) ـ وەك موعجیزەکانی پێغەمبەرانی دی - پێوەندی راستەوخۆیان بە جۆری دونیابینی و کەشی رۆژگارەکەی خۆیەوە هەبووە، لە رۆژگاری ئەودا (مادده) زۆربەی رووبەرەکانی ژیانی تەنیوە و مرۆڤی لە بەها رۆحییەکان خاڵی کردۆتەوە، قیامەت و زیندووبوونەوەی لەبیری خەڵکدا سڕیوەتەوە، جوولەکە بە جۆرێك ژیانی دونیا مەست و وڕی کردبوون، کە خوداوەندیشیان بە دەستتەنگ دەزانی((ید الله مغلولة/ المائدة/ ٦٤)) بۆیە کاتی ئەوە هاتبوو مەسیح پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بە خۆی و پەیامە رۆحیەکەیەوە گیانیان بە بەردا بکاتەوە و

زیندوویان بکاتەوە, ئاخر پەیامەکانی خودا زیندووکەرەوەن(( یا ایها الـذین امنـوا اسـتجیبوا لله و للرسـول اذا دعـاکم لمـا یحیـیکم/الانفـال٢٤)), مەسـت بـوون بـە ژیـانی کـاتیی و لەبیرچوونەوەی ژیانی جاویدانی(مەرگ)ە نەك (زیندەگی), بۆیە دەبیـنین هـەموو موعجیزەکـانی مەسـیح، بـوونی ( ڕۆح ) دەسەلمێنن: خۆی لە ئەفخێکی ڕۆحی خودا خەلق ببوو، لـە قـوڕ پەیکـەری باڵنـدەی دروست دەکرد و بـە فـوو ڕۆحـی بـە بـەردا دەکرد, مردوویەك کە جەستەی ڕزیـوە و لـە نێـو چـووە، ڕۆحـی بەبەردا دەکردەوە و زینـدووی دەکردەوە, هـەروەها منـاڵی لـە بێشکەدا دەدوانـد(( ویکلـم النـاس فـی المهـد و کهـلا ومـن الصالحین/آل عمران/٤٦)).. ،ئیدی بێجگە لەوەی ( روح القدس ) هاودەمی هەمیشەیی ئەو بوو((..و اتینا عیسی ابن مریم البینـات و ایدناه بروح القدس/ البقرة/ ٢٥٣)).

موعجیزەیـەکی دیکـەی کـە بەشـێکی پێوەنـدی بـە مـاددە و بەژیانی دونیاوە هەبوو، موعجیزەی خوانەکەی بوو, کاتێك کە لە سـەر داوای حەوارییـەکانی لـە خـوای گـەورە پاڕایـەوە خـوانێکی ڕازاوەیـان لـە ئاسمانـەوە بـۆ داگـرێ، ئـەم خوانـە لـە ئایەتەکانـــــی (١١١ – ١١٤) ی سورەتی (المائدة ) دا باسی کـراوە، سـورەتەکەش بـەناوی ئـەم موعجیزەیـەی حـەزرەتی مەسیحەوە ناو نراوە( لە قورئاندا ناوی سێ سوورەت پێوەندیان

به حەزرەتی مەسیحەوە هەیە)، ئەم موعجیزەیە بۆ ئەوە بوو حەوارییەکانی باوەڕیان پتەوترو متمانەیان بە مەسیح ( س) زێتر و لە ڕاستی پەیامەکەشی دڵنیاتر بن. وەك ئەو دڵنیابوونەی کە باوکە گەورەی پێغەمبەــــــــرمان حەزرەتی( ابراهیــــــــــم - س) داوای دەکرد بۆ یەکلایی بوونەوەی دڵی کاتێك کە ڕووی پرسیاری کردە خوای گەورە و گوتی: "چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە" ؟! چونکە ئەمانیش دەڵێن(( قالوا نرید ان ناکل منها و تطمئن قلوبنا و نعلم ان قد صدقتنا و نکون علیها من الشاهدین/المائدة/ ١١٣)).

یان دەشێ ئەم موعجیزەیە ئاماژە و هێمایەکیش بێت بۆ حەلاڵ کردنەوەی ژیان بۆ ئەوانەی کە ژیانیان بە یەکجاری لەخۆ حەرام کردبوو، ڕوویان لە چۆڵەوانیی و ئەشکەوتەکانی ڕوهبانیەت نابوو.

پەیامەکانی خودا هەروەك نایانەوێت ژیانی دونیا ببێتە دوا ئامانج و هەمووشت بێت، ناشیانەوێت ژیان بەبێ بەها سەیربکرێت و حەرام بکرێت, کۆمەڵێك ئایەت لە قورئانی پیرۆزدا بەڵگەن لە سەر ئەوەی کە کۆمەڵێك لە خەڵکی ئەو ڕۆژگارە جوانیی و نیعمەتەکانی ژیانیان لە خۆ حەرامکردبوو(( و لاحل لکم بعض الذی حرم علیکم /ال عمران/ ٥٠))...(( ورهبانیة ابتدعوها ما کتبناها علیهم/ الحدید/ ٧ )).

ئەم خولنە خوانێکی سادە و ئاسایی نەبووە, لە گەڵ داوای داگرتنیدا داواشی کردووە کە ڕۆژی دلگرتنەکەی بکات بە جێژن بۆخۆیان و نەوەیان, بێگومان جێژنیش ـ وەک ڕۆژانی دی ـ ڕۆژێکی ئاسایی نیە, ڕۆژی هەستکردنە بە چێژی نیعمەتەکانی ژیان.

خوای گەورە وەک چۆن لەو تەرزە ژیانە پڕ لە تەماعبازیی و هەڵپەکاریەی جوولەکە نارازیی بوو کە خاڵیی بوو لە سادەترین بەهای ڕۆحیی، لە ژیانی گۆشەنشینیی و ڕوهبانیەتیش نارازییە.

**مەسیح و حەواریەکانی:**

هەریەك لە پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) هەمیشە دەستەیەکی لە خەڵکی ئاسایی لێبڕاوتر و لە خۆبوردووتر لە دەوری جەم بوون و پشت و پەنای بوون, وەك یاوەرانی پێغەمبەرمان موحەممەد( د.خ ) کە قورئانی پیرۆز لە چەند جێیەکدا ستایشیان دەکات و هەر لە ژیاندا مژدەی چوونە بەهەشت بە هێندێکیان دەدات.

دۆست و هاودەمە نیزیکەکانی مەسیح پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) لە قورئاندا بە (حەواری) ناو براون, دەشێ لە ئەرك و کاردا, لە دڵسۆزی و لێبڕاندا وەك یاوەرە نیزیکەکانی پێغەمبەرمان بووبن, تەنانەت حەواریەکان هێندە گەورە و هێندە پشتیوانێکی گەورەی مەسیح بوون, خودا لە قورئانی پیرۆزدا داوا لە باوەڕدارانی دەوری پێغەمبەری ئیسلام دەکات وەك حەواریەکانی دەوری مەسیح ببن بە(انصار الله )..(( یا ایها الذین امنوا کونوا انصار الله کما قال عیسی ابن مریم من انصاری الی الله قال الحواریون نحن انصار الله/الصف/ ٤))..

لە سورەتی (ال عمران) یشدا بە هەمان شێوە ناویان براوە و باس کراون. پێغەمبەریشمان ( د.خ ) کاتێك کە (٧٥) کەسی جوامێر لە (عەقەبە ) دا بەیعەتیان پێداو بڕیاریاندا بەهێزترین

پشتیوانی بن، داوای لێکردن "دوازده کەسـتان وەرنـه دەرێ بـۆ ئـەوەی ئۆبـاڵی خێڵـەکانتان وە ئەسـتۆ بـــــــــــگرن وەك حەواریەکانی عیسا "٢"

بۆیە لای موسوڵمانان نەك هـەر عیـسا خـۆی، بەڵـــــــــکو حەواریەکانیـــشی گــــــــــەورەو پێـــشەنگ و سەرمەشـــق بـــــــوون(( وقفینـا بعیـسی ابـن مـریم و اتینـاه الانجیـل و جعلنا فی قلوب الذین اتبعوه رافة و رحمة/ الحدید/ ٢٧)).

**وێنەیەک لە تەعەسب و.. وانەیەک لە تەوحید:**

چەند ئایەتێك لە سورەتی (المائدة ١١٥-١١٩)دا، دەمانبەنە بەردەم یەکێك لە تابلۆ درەوشاوەکانی ئەدەبی مەسیح (د.خ) لە حوزووری پەروەردگاری خۆیدا: خوداوەند لە ( بەنی ئیسرائیل) تووڕەیە، خەڵکێك لەوان لە ناسینی خودا و عیسای پێغەمبەریدا بە هەڵەدا چوون و سەریان لە ( شیرك )ەوە دەرچووە " ئەی عیسا! ئەرێ تۆ بەو خەڵکەت گوتوە خۆت و مەریەمی دایکت، وەك " دوو خودا " بپەرستن ؟ .. نا (سبحانك ) .." پاکی و بێگەردیی بۆ تۆ خودایە، من قەد ڕێم ناکەوێ هیچ شتێك جگە لە ڕاستی بڵێم، ئەگەر شتی وەهام گوتبا تۆ بۆ خۆت دەتزانی، هەر چیەکیشم بە ناخی دڵدا ڕابووریێ تۆ دەیزانی، ئەوە منم دەربارەی تۆ هیچ نازانم، تەنیا هەر تۆ لە گشت نەدیار و پێواران ئاگاداری، هەر ئەوەم پێگوتون کە خۆت فەرمووتە و فەرمانتداوە، گوتومە هەر تەنها خودا بپەرستن کە پەروەردگاری منیش و ئێوەشە، هەتا لە ناو ئەوانیش بووم ئاگادار و چاوەدێری باوەڕیان بووم، لەوساشەوە کە منت بۆ خۆت بردەوە بۆ خۆت هەر ئاگاداریان بووی، گەر بتەوێ ئازاریان بدەی، بەندەی خۆتن، گەر بشتەوێ لێیان

خۆشـبـبیت، خـۆت دەزانـی و هـەر بـۆ خـۆتی کـە ئەسـەڵات بەدەستە و لە کارزانی. "٤"

لـە ئاوێنـەی ئـەم ئایەتانـەدا جـوانترین ئـەدەبی بەندایـەتی دەدرەوشـێتەوە، بەرانبـەر بـەو کەمبانەی ئـەمیان لـەلا بووەتـە خودا، عیسا پێغەمبەر بە زمانی حاڵ دووپاتی دەکاتەوە کە ئـەو لە حوزووری پەروەردگاریدا بەندەیە و بەس، ئەو کـەش و هـەواو حاڵەتەی تێیدا دەپەیڤێ بۆ خۆی شایەتە لەسەری کـە ئەوچییە و کێیە:( خودایە من ئەمەم کە دەمبینی وەهـا رازونیـاز دەکـەم، ئەمە کەی حاڵی کەسێکە خۆی بە خودا بزانـێ یـان بـە "خـودا" بزانـرێ ) واتـە عیـسا (س) شـێواز و ئـەدەبی وەڵامەکـەی و ملکەچبوونی لە کاتی قسەکردنیدا، بەندایـەتی لێدەچۆڕێ، واتـە لێرەدا وێنەی حاڵەتەکە ئامادەیی هەیە، نەک قسەی ڕووت و بێ ڕوح، بەو ئومێدەی کەسانی لادەر لە دەورووبەری، ئەگەر توانای بیستنیان نەبێت، توانای بینینیان هەبێت.

لـەم کـات و حاڵەتـەدا کـە سـێبەری هەیبـەتی خـالیق بەسـەر سەریەوەیەتی، ئەو خەڵکە نەزانەشـی لـەبیرە کـە ئـەو بـە خـودا دەزانن، بۆیان دەپاڕێتەوە، هەرچەند دەشزانێت مەقامەکـە هـی نواندنی بەزەیی نیە، ئەوەتا ( إن تعذبهم ) پێش ( إن تغفر لهم ) دەخـات، بـەڵام دەزانـێ خـودا خودایـەتی دەکـات، وێـڕای کـاتی

لێبوردن و بەزەیی نواندن، لە کاتی تووڕەیی و دەرخستنی دەسەڵاتیشدا دەتوانێ ببورێ.

ئایەتەکانی (١١٥ –١١٨) ی سوورەتی (المائدة) و ئەم گفتوگۆیەی نێوان پەروەردگار و مەسیحی پێغەمبەری (د.خ) لەلایەکەوە نواندنی درەوشاوەترین وێنەی بەندایەتیە و لە لایەکی دیکەشەوە دەرخستنی دەریای سۆز و بەزەییەکە کە لە هەستێکی قووڵی مرۆڤدۆستییەوە سەرچاوەی گرتووە، با مرۆڤەکانیش ئەو کەسانە بن کە عیسا بە خودا دەزانن.

ناشێ خوێندنی ئەم ئایەتانە ناخمان نەهەژێنن، ئاخر پێغەمبەرمان (موحەمەد. د.خ) شەوێکیان لەدەمی خوێندنی قورئاندا کە گەیشتە بەردەم ئەم ئایەتانە نوقمی گریان بوو، تا دەمەو بەیان بەدەم گریانەوە هەر ئەم ئایەتەی دەگوتەوە - وەك ئیمام ئەحمەد لە (ئەبی زەڕ)ەوە ریوایەتی کردووە: ((إن تعذبهم فإنهم عبادك و إن تغفر لهم فإنك أنت العزيز الحكيم/المائدة/ ١١٨)).

**نێوانی مەسیح و موحەممەد (سڵاوی خوایان لێبێت):**

شانازیی کردن بە موحەممەدەوە لە بەرانبەر پێغەمبەرێکی برایدا(سڵاوی خوایان لێبێت)بەجۆرێك کە بۆنی دەمارگیریی لێبێت کارێکی نەشیاو و نادروستە و پێغەمبەرمان(د.خ) خۆی رێگەی لێگرتووە: (عن ابي سعيد الخدري ، عن الرسول: لا تخيروا بين الانبياء /متفق عليه))هەروەها: (عن ابي هريرة ـ ر.ض ـ: لا تفضلوا بين الانبياء/ اخرجه البخاري/ مشكاة المصابيح) بەتایبەت کە لەبارەی حەزرەتی مەسیحەوە (د.خ) فەرموویەتی: (انا اولى الناس بابن مريم .....ئیبن حەببان لە ئەبی داودەوە ریوایەتی کردووە ..).

لە فەرموودەیەکیشدا کەباس لە چەند فەزڵێکی خۆی دەکات زوونوو دەفەرموێ :"بەبێ شانازییکردن" : ( انا سيد ولد ادم يوم القيامة ..ولافخر..، وبيدي لواء الحمد ...ولا فخر .....الخ /تيرمزی و ئەحمەد و ئیبن ماجە ریوایەتیان کردووە).

هەر لە رۆژگاری ژیانی خۆیشیدا، رێککەوتووە موسڵمانێك وجوولەکەیەك لەسەر باسی فەزڵ و گەورەیی پێغەمبەرەکانیان (س) شەرەقسە بکەوێتە نێوانیانەوە . موسڵمانەکە بە خۆ هەڵکێشانەوە بەرانبەر بە جوولەکەکە بڵێ : "والذي اصطفى محمدا على العالمين..." ئەویش بە هەمان هەستەوە وەڵام

بداتــەوە: "والــذي اصــطفى موسـى علـى العـالمين.... " لــە ئاكامیشدا بەرانبەر بە سكالاّی جوولەكەكە لای پێغەمبەر(د.خ)، بـە موسـلّمانان بفـەرمووێ:((لا تخیرونـي علـى موسـى ....الخ /صحیح البخاری)) "١".

مەسیح دوا پێغەمبەری (بـەنی ئیسرائیل)ە،(موحەممەد) یش دوا پێغەمبـەری مرۆڤایەتیـە و راسـتەوخۆ بـە دووی مەسـیحدا هاتووە و پێغەمبەری دی نەكەوتۆتە نێوانیان.

(مەسیح) مژدەهێنی هاتنی پێغەمبەرمانـــــە(( انـی رسـول الله الیكم مصدقا لما بین یدی من التوراة و مبـشرا برسـول یـاتی مـن بعدی اسمه احمد../الصف/٦)) ..،شۆنكەوتووە راستەقینەكانی (مەسیح) یش لەوانە بوون كە زۆر لە پـەیامی ئیسلامەوە نێزیـك بوون، قورئان بەم شێوەیە ستایشی ئەوان دەكات:

ـ((لتجدن اشد الناس عداوة للذين امنـوا اليهـود و الـذين اشـركوا ولتجدن اقربهم مودة للذين امنوا الذين قالوا انا نـصارى ذلـك بـان منهم قسيسين و رهبانا و انهم لا يستكبرون/المائدة/٨٢)).

ـ (( واذا سمعوا ما انزل الى الرسول ترى اعينهم تفيض من الـدمع ممـا عرفـوا مـن الحـق يقولـون ربنـا امننـا فاكتبنـا مـع الشاهدين/المائدة/٨٣)).

ـ(( ما لنا لا نؤمن بالله و ما جائنا من الحق و نطمع ان يدخلنا ربنا مع القوم الصالحين، فاثابهم الله بما قالوا جنات تجرى من تحتها الانهار خالدين فيها و ذلك جزاء المحسنين/المائدة/٨٤)).

ـ (( ليسوا سواء من اهل الكتاب امة قائمة يتلون ايات الله  اناء الليل وهم يسجدون... يؤمنون بالله و اليوم الاخر و يامرون بالمعروف وينهون عن المنكر و يسارعون فى الخيرات و اؤلئك من الصالحين/ال عمران / ١١٣ـ١١٤)).

له هیجرەتی هێندێك له یارانی پێغەمبەرماندا(سڵاوی خودایان لێبێت)بۆ وڵاتی حەبەشه و بوونیان بە پەنابەر لە سێبەری دەسەڵاتی (نەجاشی)دا کە پاشایەکی دادپەروەری سەر بەئایینی مەسیح بووە، *وێنەیەکی دیکەی ئەم نزیکییەی نێوان موحەممەدی پێغەمبەرمان و مەسیح و شکۆنکەوتووانی* تێدا دەدرەوشێتەوە.

بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش له مەدینە بەر بێ ناستەنگییە. له چاو مەککەدا ـ دەشێ هۆکارەکەی مانەوەی ئاسەواری ئەو فەزا ئیمانیەی پەیامەکانی حەزرەتی موسا و عیسا(س) بووبێت.

هەر بۆیەش دەرگای دیالۆگ له نێوان ئیسلام و ئاینەکاندا ـ بە تایبەتی ئەهلی کیتاب ــ تا رۆژی قیامەت بە کراوەیی دەمێنێتەوە ((قل يا اهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا و بينكم  الا نعبد الا الله ولا نشرك به شيئا ولا يتخذ بعضنا بعضا

اربابا من دون الله..فان تولوا فقولوا اشهدوا بانا مسلمون/آل عمران/ ٦٤)) خۆ ئەگەر لەم دیالۆگەدا بە ئاكام نەگەیشتن, ئەوا دەبێ لەگەڵ موسڵماناندا پێكەوە و بە ئایینی خۆیانەوە بژین و پێوەندی جۆراو جۆر لە نێوانیاندا هەبێت:

ـ ((و طعام الذین اوتوا الكتاب حل لكم و طعامكم حل لهم....و المحصنات من الذین اوتوا الكتاب من قبلكم..../ المائدة/ ٥ ))

وێڕای ئـــــــــــــــــەم ئایەتانە كە باس لە هێندێ مامەڵەی تایبەت لە ئەهلی كیتاب دەكەن وەك حەڵاڵیی خواردنیان و خواستنی ژن لێیان و ... هتد، كۆمەڵێ ئایەتی دی كە باس لە رێزگرتنی مرۆڤ بە گشتی و ئازادیی ئایینیی و باس لە دڵپەروەری و میهرەبانی و بوردەباری و غەدرنەكردن و ئەمەكداری دەكەن " چوارچێوەیەكی گشتی مامەڵە كردنن لەگەڵ ناموسڵمانان بەگشتی. ئەمە بێجگە لەوەی كەئازادیی باوەڕ و ئایین، كۆمەڵێ مافی دیكەی وەك ئەنجامدانی دروشمی ئایینی و دروستكردنی پەرستگە و پێكهێنانی كۆمەڵە و رێكخراوەی سیاسیش بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

**بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان:**

لە سەرەتادا گوتمان خودای گەورە لە جۆری دروست کردندا دەسەلات و مەشیئەتی خۆی نواندووە و لە خەلقکردنی مرۆدا چەند وێنەیەکـــــــــی لێکجودای ( خەلق )ی نیشانداوە, لێرەشدا دەڵێین لە مراندنیشدا چەند وێنەیەکی لێکجودای نیشانداوە

- مردنی (هاورێیانی ئەشکەوت):((فضربنا علی اذانهم فی الكهف سنین عددا، ثم بعثناهم/ الكهف/١١))... (( و تحسبهم ایقاظا وهم رقود /الكهف/ ١٨)).

- مەرگی ( ئیدریس/ سلاوی خوای لێبێت )..(( و رفعناها مكانا علیا /مریم/٥٧ )).

- مەرگی (عوزەیر / سلاوی خوای لێبێت) ..((فاماته الله مئة عام ثم بعثه/ البقرة/٢٥٩)).

- مەرگی (سولەیمان/ سلاوی خوای لێبێت)..((فلما قضینا علیه الموت ما دلهم علی موته الا دابة الارض تاكل منسئاته/ سبأ/ ١٤)).

ئەمانە چەند جۆر و چەند وێنەیەکی لێکجودای مەرگ بوون, جودا لەو مردنەی کە ئێمە دەیبینین, خوداوەند لەو وێنانەوە گەورەیی و دەسەلاتی خۆی نیشان دەدات, هەروەك لە

(خەلق)دا، خەلقی ئادەم و حەوا و عیسا(سلاوی خودایان لێبێت ) کە هەریەکەیان جودا لەیەکتر و جودا لە مرۆڤانی ئاسایی خەلق کراون، دەسەلاتی خۆی نیشانداوە.

مەسیح پێغەمبەریش (سلاوی خودای لێبێت) وەك چۆن خەلق کردنی و هاتنی بۆ سەر زەوی موعجیزەیی بوو، مژدەی خەلقکردنی لە ئاسمانەوە گەیەنرایە سەر زەوی بە ناو و نازناوییەوە, ئاساییە لە کۆتایی ژیانی زەمینییشدا بۆ ئاسمان بۆ نشینگەی پێشووی خۆی، بۆ خزمەتی پەروەردگاری و بۆ سەرچاوەی خەلقکردنی بگەڕێتەوە, ئاخر ئەو راستەوخۆ لە نەفخی رۆحی خودا بەوجود هاتبوو, راستە هەموو رۆحێك بۆ ئاسمان بلند دەبێتەوە, بەلام ( مەسیح ) جەستەشی لەگەڵ رۆحیدا بەرز کرایەوە, چونکە جەستەی لە نێو رۆحیدا سووتابوو, ئەو هێندەی کە رۆح بوو جەستە نەبوو, ئەو هێندە عابیدانە و رۆحانیانە ژیا, نەیهێشت ئەو رۆحەی غوباری سەر زەوی لێ بنیشێ, بە پاکی و درەوشاوەیی هێشتیەوە, تاخودای گەورە بە دەستی قودرەتی خۆی بۆ ئاسمان بلندی کردەوە.

ئەو هاتنی بۆ سەر زەوی و تێپەڕبوونی بەسەریدا هەمووی موعجیزەیی بوو, گەڕانەوەشی ئاساییە موعجیزەیی بێت،